پێکهاتەکانی خوێن، ناونراوە

# گـــەشەکردنی منداڵ

**نەوزاد کەلهوڕ**

**هەولێر - ٢٠١٠**



**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **گـــەشەکردنی منداڵ**
- نووسینی: نەوزاد کەلهوڕ
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- پیتچنین: نسار عەبدوڵلاّ حەسەن
- بەرگ: حەمیدە یوسفی
- ژمارەی سپاردن: (٧٠)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١٠
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٤٣٧)**



**ماڵپەڕ**: www.mukiryani.com
**ئیمەیل**: info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# پێشەکی

هەر جارەی باس لە جیهانی منداڵ دەکرێت، مرۆڤ بەشێوەیەکی راستەوخۆ دونیای بەرائەتی دێتە بەرچاو، چونکە منداڵ خاوێنە وەك پەڕەی گوڵ، بەڵام کاتێك دێتە سەر دونیا و تێکەڵ بە ژینگە دەبێت، ئەو ژینگەیە ئاراستەی دەکات بەرەو لایەنی خێر و شەڕ، لە سەدەی نۆزدە گرنگییەکی زۆر بە منداڵ درا، لە رێگای توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیاندا زۆر راستییان بۆ دایکان و باوکان روون کردەوە بەتایبەتیش سایکۆلۆژیای فێرکردن کە هەنگاوێك بوو بۆ بەرەو پێش چوونی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن، ئەرکی ئێمە دیار و ئاشکرایە، گەر بمانەوێت کۆمەڵگایەکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو پێبگەین دەبێت لە پەروەردەی منداڵەوە، چونکە منداڵ لە ئایندەیەکی نزیکدا ئەرکی بەرپرسیاریەتی ئەو گەل و نیشتمانەیان دەکەوێتە ئەستۆ.

لێکۆڵینەوەکانی مەیدانی کە لە بواری پەروەردە و دەروونزانیدا ئەنجام دەدرێن هەر هەموویان رێژەیین، یاخود بە مانایەکی دیکە بڵێین شتێك نییە لە دەروونیدا ناوی بێنێن جێگیر واتە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە جیاوازە جگە لەوەش لە هەمان کۆمەڵگادا لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی دیکە دەگۆڕێت، و ئەو لێکۆڵینەوانەی سوودمان لێ وەرگرتووە مشتێکن لە خەروایەکە.

گەر بڵێین دەروونزانی زانستێکی نوێیە کە سەربەخۆیی خۆی وەرگرتووە لە زانستەکانی دیکەوە بەتایبەتیش لەناو ئێمەی کورددا لە راستی دوور ناکەوینەوە.

بۆیە ئەو زانستە لە رووی زاراوەوە لە زمانی کوردیدا هەژارە، بۆیە گەلێك جار پەنا بۆ شیکردنەوەی زاروەکان براوە بۆ ئەوەی خوێنەر بەئاسانی لێی حاڵی بێت، دیارە



هیچ بابەتێکیش خاڵی نابێت لە هەڵە و کەموکوڕی، بۆیە داوا لە خوێنەران دەکەم لە هەر شوێنێك کەموکوڕی هەبێت لە رێگای بڵاوکردنەوە ئاگادارم بکاتەوە سوپاسی دەکەم، ئیتر دەست لەناو دەست هێز لە خوا.

دواجار دەمەوێ ئەوە بە خوێنەران بگەیێنم هەندێك لەو بابەتانە لە کات و ساتی خۆیاندا لە گۆڤار و رۆژنامەکانی نێوخۆدا بڵاوکراونەتەوە.

**نەوزاد کەلهوڕ**
**١٣-١٠-٢٠٠٨**
**شۆڕش - هەولێر**

# گەشەکردن

گەشەکردن بریتییە لەو هەموو گۆڕانکارییانەی بەسەر جەستەی مرۆڤدا دێت، ئەویش بەهۆی ئەو ئاوێتەبوونە کیمیاوییەی کە دەبێتە هۆی زیادبوونی کێش و بالاّ و قەبارەی لەش، لەو ڕێگایەشەوە ئەو ئامانجە دێتە جێ بۆ تەواوبوونی پرۆسەی گەیین: (نضج)، (گەیین)یش بریتییە لە گەیشتنە ئەو ئاستەی کە گۆڕانکارییەکانی گەشەکردن ئەگا پێی بە کۆئەندامەکانی لەش، هەتا دەگاتە ئەو ئاستەی کە دەتوانێت بە کارەکانی خۆی هەستێت. پرۆسەی گەیین جیاوازی هەیە لەگەڵ کۆئەندامەکانی لەش وەکو هەناسەدان و سوڕی خوێن و کۆئەندامی زاوزێ.... هتد.

هەندێك لە کۆئەندامەکانی لەشی مرۆڤ هەر لە زووەوە پێی دەگات وەکو کۆئەندامی سوڕی خوێن و هەناسەدان، بەڵام هەندێکی دیکەیان درەنگ پێی دەگات تاکو دەگاتە قۆناغی منداڵی ناوەند (الطفولة الوسطى) وەکو کۆئەندامی زاوزێکردن، هەندێك جاریش دەبێت منداڵ پێویستی بە کات هەیە بۆ فێربوونی وەکو ئەو منداڵەی لە سەرەتای تەمەنیدا پێویستی بە کات هەیە بۆ فێربوونی قسەکردن، هەروەکو دەروونزان جیزل دەڵێت منداڵ لە سەرەتادا پێش ئەوەی فێری قسەکردن بێت کغە کغ دەکات ئینجا زمان دەگرێت فێری قسەکردن دەبێت. هەروەها منداڵ لە سەرەتای لەدایکبوونیدا قاچەکانی تەواون لە رووی تەندروستییەوە، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا نەگەیشتوونەتە گەیین ناتوانێت بە قاچەکانی بڕوات، بەڵام پاش ئەوەی تەمەنی گەیشتە ساڵەوەختی قاچەکانی یاخود کۆئەندامی دەمارەکانی قاچی دەگاتە رادەی گەیین ئینجا دەتوانێت لەسەر قاچەکانی بوەستێت و پاشان دەست بە رۆیشتن بکات. کەواتە هەروەك جمال حسین



الالوسی لە کتێبی (علم النفس الطفولة والمراهقة)دا دەڵێت: (گەشەکردن بریتییە لە گۆڕانکاری چەندێتی یاخود پێکهاتەیی، بەڵام گەیین مانای گۆڕانکارییە لە جۆری) کەواتە هەردووکیان پڕکەر و تەواوکەری یەکترن، یاخود بە مانایەکی دیکە بڵێین هەریەکەیان پشت بە ئەوی دیکە دەبەستێت.

## بوارەکانی گەشەکردن:

دەروونزانەکان گرنگییەکی زۆر بە گەشەکردن دەدەن، هەر بۆیە ئەو گەشەکردنەیان پۆلین کردووە بۆ سێ کۆمەڵە:

١- کۆمەڵەی یەکەم گرنگی دەدات بەو زنجیرە گۆڕانکارییانەی کە مرۆڤ پێیدا تێپەڕ دەبێت لە ژیانی خۆیدا وەکو زمان و هەستکردن و توانستەکانی جوولەیی.

٢- کۆمەڵەی دووەم گرنگی دەدات بە جیاوازی نێوان تاکەکان و هەوڵ دەدرێت هۆکارەکانی ئەو جیاوازییە روون بکرێتەوە لەگەڵ تایبەتمەندییە روون و ئاشکراکان وەکو رێژەی زیرەکی و هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتی و خۆ گونجاندنی تاك لەگەڵ دەوروبەرەکەی.

٣- کۆمەڵەی سێیەم گرنگی دەدات بە جیاوازی لە نێوان تاکەکاندا کە رۆشنبیری و شارستانییەتیان لەگەڵ یەکدا جیاوازە لە رووی باری کۆمەڵایەتی و بایلۆجییەوە.

لایةنةکانی طةشةکردن:

١- لایەنی عەقڵی و مەعریفی وەکو (پەیبردن - ادراك)، بیرکردنەوە و تێگەیشتن، چارەسەری کێشەکان.

٢- لایەنی کۆمەڵایەتی دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و خۆگونجاندن.

٣- لایەنی جوولەیی وەکو زیادبوونی کێش و بالاّ.

## پرەنسیپەکانی گەشەکردن:

بریتییە لە کۆمەڵێك بنەمای سەرەکی، کەواتە گەشەکردن پرۆسەیەکی بەردەوامە، هەر لە دوای ئەوەی هێلکەی مێینە لەگەڵ سپێرمی پیاو یەکیان گرت، ئەوا گەشەکردنی کۆرپەلەیە لەناو منداڵدانی ئافرەت، پاشان کە لە دایکی جیا دەبێتەوە، تاکو لە ژیاندا مابێت.

هەروەها هەر تاکێك ڕێگایەکی تایبەتی هەیە لە گەشەکردن، واتە جیاوازی تاکییەتی ڕۆڵی خۆی هەیە لەو گەشەکردنە، پاشان گەشەکردن ئاوێتەبوونی هەردوو هۆکاری ژینگە و بۆماوەیە، زۆربەی لێکۆڵینەوەکانی بواری گەشەکردنی منداڵ ئاماژە بەوە دەکەن دابەشبوونی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لەسەر بنچینەی دابەشبوونی سروشتی دابەش بووینە.

دابەشبوونی سروشتی بریتییە لە نێوەندە ژمێرەی ناوەڕاست ٦٤٪ کە زۆربەی خەڵکی بەو شێوەیە کەوتۆتە خانەی ناوەڕاست، وە لە لای چەپ ڕێژەی ١٣٪ وە لە لای دەستی ڕاست ١٣٪، خێرایی گەشەکردن جیاوازە لە قۆناغەکانی ژیانی تاکدا، بۆ نموونە خێراترین قۆناغ قۆناغی کۆرپەلەیە لەزکی دایکدا، کە لە خانەیەکی بچووکدا گەشە دەکات لە ماوەی نۆ مانگدا دەبێتە ٣,٥ کغم باڵای دەبێتە ٤٥ سم.

## ڕێگاکانی لێکۆڵینەوە لە دەروونزانی گەشەکردن:

لێکۆڵینەوە لە دەروونزانی منداڵ لە لایەن لێکۆڵەرەوانەوە گرنگییەکی زۆری پێدراوە، هەر یەکێك لەو لێکۆڵینەوانەش کۆمەڵێك گیروگرفتی گەشەی چارەسەر کردووە، وە هەریەکەشیان لایەنی چاکە و خراپی خۆیان هەیە.

**لێکۆڵینەوەکانی سروشتی:** لێکۆڵەرەوە هەڵدەستێت بە کۆمەڵێك تێبینی لەسەر منداڵ لە ژینگەیەکی سروشتی، هەرچی ڕەفتاری منداڵ هەیە زۆر بە وردی تۆماری دەکات، بۆ نموونە نووسینەوەی ژیاننامەی منداڵ کە یەکەمجار زانای بایلۆجی (داروین) هەستا



بە تۆمارکردنی ژیاننامەی منداڵەکەی خۆی هەرچی لە ژیانی رووی دەدا تۆماری دەکرد، پاشان زانای سویسری (جان پیاجە) لێکۆڵینەوەی لەسەر پێشکەوتنی عەقڵی یاخود گەشەی مەعریفی کرد، ئەویش لە ڕێگای تۆمارکردنی تێبینی، بەڵام ئەوە کارێکی وا سووك و ئاسان نییە چونکە ڕێژەیەکی کەم لە دایکان و باوکان توانای نووسینەوەی ژیاننامەی منداڵەکانیان هەیە، هەروەها ئەو ڕێگایە زیاتر ڕێگایەکی خودییە (ذاتي) وەك لەوەی بابەتی بێت.

ڕێگای دیکە هەیە بۆ لێکۆڵینەوە لە گەشەکردن بریتییە لە ڕێگای ئاسۆیی و ستوونی

**ڕێگای ستوونی:** لێکۆڵەرەوە هەڵدەستێت بە تێبینیکردنی تاك یاخود کۆمەڵێك کەس وە تۆمارکردنی هەموو ئەو گۆڕانکارییانەی بەسەریاندا دێت لە ماوەیەکی کاتی دیاریکراو واتە کۆمەڵەی یەکەم لە ساڵی یەکەمدا هەرچی گەشەکردن هەیە لە ژیانیاندا تۆمار دەکرێت، پاشان هەمان کۆمەڵە لە ساڵی دووەم بەو شێوەیە بەردەوام دەبێت.

ئەو ڕێگایە لایەنی باشی لەوە دایە لێکۆڵەرەوە دەتوانێت زانیارییەکی باش بەدەست بهێنێت لەسەر گەشەکردن، بەڵام ئەو ڕێگایە گەلێك کاتی پێویستە و هەروەها مەسرەفێکی زۆری دەوێت، لەوانەش ناخۆشتر ئەوەیە ئەو منداڵانەی کە تێبینییان لەسەر تۆمار دەکرێت هەندێك جار وا دەبێت منداڵەکان سەفەر دەکەن یاخود دەمرن یاخود کەسوکاریان ڕازی نابن بۆیە هەرچی ماندووبوون هەیە بەفیڕۆ دەڕوات.

**ڕێگای ئاسۆیی:** کە ڕێگایەکی دیکەیە لە یەك ساڵدا لێکۆڵینەوە لەسەر کۆمەڵێك منداڵ دەکرێت، بەڵام بەمەرجێك هەر کۆمەڵە منداڵێك لە تەمەنێکدا بن، بۆ نموونە کۆمەڵەی یەکەم هەموویان تەمەنیان یەك ساڵانە کۆمەڵەی دووەم دوو ساڵ و بەم شێوەیە.

ئەو ڕێگایە لێکۆڵەرەوە دەتوانێت لە ماوەیەکی کەمدا زانیارییەکی باش کۆ بکاتەوە، بەڵام زانیارییەکان زۆر وردنین وەکو ڕێگای پێشوو.

## توانستەكانی منداڵی تازە لەدایكبوو:

منداڵ كاتێك لە سكی دایك دایە بەهۆی پەتكە ناوك (الحبل السري)یەوە هەناسە و خواردن وەردەگرێت، پاش جیابوونەوەی لە دایكی دێتە ژینگەیەكی نوێ، لەو ژینگەدا پێویستی بە كۆمەڵێك پێویستی دەبێت بۆ ئەوەی بتوانێت درێژە بە ژیانی خۆی بدات، لە سەرووی هەموویانەوە توانستی فسیۆلۆژییە، كە بریتییە لە هەناسەدان و خواردن و خواردنەوە و كۆئەندامی هەرس... هتد، هاواری یەكەمی منداڵ سەرەتای هەناسەدانی منداڵە، بەردەوام دەبێت بەدرێژایی ژیانی.

منداڵ تێكرای هەناسەدانی لە خولەكێكدا نزیكەی ٣٥ جار دەبێت، بەڵام ئەو رێژەیە زیاد دەكات لە كاتی گریاندا بە تێكڕای ١٣٠ جار لە دەقیقەیەكدا، هەروەها لێدانی دڵی ١٤٠ جار دەبێت لە خولەكێكدا واتە دووجار بەقەد گەورەكان، هەروەها كۆئەندامی هەرس كار دەكات بۆ هەرسكردنی ئەو خواردنەی دەخوات، بەڵام خواردنەكە بریتی بێت لە شیر و هەندێك شلەمەنی، كە كۆئەندامی كار بكات بۆ هەرسكردنی خواردەمەنی هەڵبەتە دەبێت كۆئەندامی فرێدانی پاشەرۆشی هەبێت لە ماوەی شەو و رۆژێكدا بە تێكڕای (٢ - ٧) جار هەروەها میزكردنی لە ماوەی شەو و رۆژێكدا نزیكەی ١٨ جار دەبێت.

## توانستەكانی هەستی منداڵ:

هەر پێنج هەستەكەی منداڵ ئامادەیە بۆ كاركردن بۆ ئەوەی بە كارەكانی خۆیان هەستن، بەڵام ئەوەندە هەیە هەر هەموویان وەكو یەك نین، بەڵكو هەندێكیان لە هەندێكیان چالاكترن.

بۆ نموونە (١) **هەستی بینین (چاو):** لای منداڵ هەیە هەر لە كاتی جیابوونەوەیدا بە بەڵگەی ئەوەی ئەگەر بێتو تیشكی رووناكی لە چاوی بدەی چاوی دەنووقێنێ، هەروەها ئەگەر تیشكی رووناكییەكە كەم بێت چاو بەدوای رووناكییەكەدا دەگێرێت، بەڵام تاكو ئێستا لێكۆڵینەوەكان نەگەیشتوونەتە ئەنجامێك دەربارەی جیاوازی رەنگ لەلای منداڵ، ئەویش بەهۆی كەم توانایی منداڵ كە ناتوانێت قسەی لێ وەربگیرێ.



**(٢) رووژاندنەكانی بیستن (گوێ):** منداڵ لە بچووكیدا سەری خۆی دەجووڵێنێت بەرەو ئەو لایەی كە دەنگی لێوە دێت، كەواتە منداڵ توانای هەیە دەستنیشانی ئەو شوێنە بكات كە دەنگی لێوە دێت.

**(٣ – ٤) هەستی چێژ وەرگرتن (بۆنكردن):** منداڵ ئەو هەستەی بەهێزە و دەتوانێت جیاوازی لەنێوان تامی شتی شیرین و ترش بكات، هەر كاتێك شیرینی لەناو شووشەی مەمە بكەی بە جوانی دەیخوات، بەڵام ئەگەر هاتوو خوێ لەناو هەمان شووشە بكەی نایخوات ئەمە بەڵگەیە كە توانای جیاوازیكردنی هەیە بەهۆی هەستی تامكردنەوە.

**(٥) هەستی دەست لێدان:** منداڵ توانای وەڵامدانەوەی هەموو رووژاندنێكی هەیە لە كاتی سەرما و گەرما و ئێش و ئازاردا هەر كاتێك رووژاندنەكە واتە ئازارەكە زۆربێت وەڵامدانەوەی بەهێز دەبێت واتە هاوار و گریانی بەهێز دەبێت.

## هۆكارەكانی گەشەكردن:

گەشەكردن لە شێوەی جەستەیی دەروونی و كۆمەڵایەتییەوە كاریگەرە بە كۆمەڵێك هۆكار لەوانە هۆكاری بۆماوە و پێكهاتەی ئەندامی وەكو رژێنەكان (الغدد)، هەروەها جۆری خواردن و ژینگەی كۆمەڵایەتی، بەڵام بەشێوەیەكی سەرەكی ئەو گەشەكردنە خۆی لە دوو هۆكاری سەرەكی دەبینێتەوە كە بریتین لە هۆكاری بۆماوە و ژینگە.

١- **هۆكاری بۆماوە:** بریتییە لە كۆمەڵێك سیفاتی بۆماوەیی كە لە باوانەوە دەگوازرێتەوە بۆ نەوەكانی، یاخود لە نەوەیەكەوە بۆ نەوەی دوای خۆی.

ژیانی مرۆڤ سەرەتا لە یەكگرتنی هەردوو خانەی نێر و مێ دەست پێ دەكات كە بە زایگۆت دەناسرێت، كەواتە هەموو بوونەوەرێك بە هەموو شێوەكانییەوە لە سەرووی هەموویانەوە مرۆڤ بە لەدایكبوونەوە دەست پێ دەكات.

پرۆسەی گواستنەوەی بۆماوەیی لە لای مرۆڤ بریتییە لە (٤٦) كرۆمۆسۆم لە هەر خانەیەك لە خانەكانی لەشی مرۆڤدا وەكو باس كرا (٢٣) جووت كرۆمۆسۆم هەیە كە ئەوانەش هەڵگری سیفاتی بۆ ماوەین و پێیان دەگوترێت (جینات) كە بریتین لە تەنی

زۆر بچووک کە بەرپرسن لە گواستنەوەی سیفاتی بۆماوەیی، لە کاتی یەکگرتنی پیتێنی نێرینە لەگەڵ خانەی مێینە، نیو واتە (٢٣) کرۆمۆسۆم لە هەریەکەیان (نێرینە و مێینە) زایگۆت دروست دەبێت کە دەبێتە (٤٦) کرۆمۆسۆم، نیوەی لە باوکەوە و نیوەکەی دیکە لە دایکەوە.

کرۆمۆسۆمی ژمارە (٢٣) لە هەر خانەیەک، هەڵگری بۆماوەیی رەگەزین، واتە دەستنیشانی رەگەزی کۆرپە دەکات لە زکی دایکدا، کە ئایا کۆرپە کچە یاخود کوڕە.

کرۆمۆسۆمی رەگەزی لەلای نێر بریتییە لە (xy) بەڵام کرۆمۆسۆمی رەگەزی لەلای مێینە بریتییە لە (xx)، جا ئەگەر هاتوو هەر کاتێک کرۆمۆسۆمی رەگەزی نێر (y) لەگەڵ کرۆمۆسۆمی رەگەزی مێ (x) یەکیان گرت، ئەوا زایگۆت دەبێتە (xy) واتە کۆرپەلە دەبێتە رەگەزی نێر، بەڵام ئەگەر هاتوو (x)ی نێر لەگەڵ (x)ی مێ یەکیان گرتئەوە کۆرپەلە دەبێتە (xx) واتە کچ لە هەردوو باردا کرۆمۆسۆمی ئافرەت (xx)، گرنگ کرۆمۆسۆمی نێرینەیە (xy) کەواتە دەستنیشانکردنی رەگەزی کۆرپەلە لەلای پیاوەوەیە نەک لای ئافرەت.

تایبەتمەندییەکانی جەستەییش وەکو رەنگی پێست و رەنگی چاو و پرچ هەروەها درێژی باڵا جگە لە هۆکاری بۆماوەیی هۆکاری ژینگەش رۆڵی خۆی هەیە، هەروەها پەشێوی عەقڵی وەکو منداڵی مەنغولی و تایبەتمەندی کەم عەقڵی کەمی رێژەی زیرەکی پەیوەندی هەیە بە کۆئەندامەکانی دەمار و زیادی لە ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان کە هەندێک جار دەبێتە (٤٧) کرۆمۆسۆم، کە منداڵ تووشی کەم عەقڵی دەبێت.

وە هەندێک خاسییەت و تایبەتمەندی دیکە هەیە وەکو نەخۆشی دەروونی بەهێز و هەندێکی سووک، کە هەندێک لە زانایان بەتایبەتی زانایانی فسیۆلۆژی هۆکاری سەرەکی بۆ هۆکاری بۆماوەیی دەگەڕێننەوە، بەڵام هەندێکی دیکە بەتایبەتی زانایانی رەفتاری بۆ هۆکاری ژینگەیی دەگەڕێننەوە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی لەسەر ئەو بنەمایە رێککەوتنێکی گشتی هەیە کە دەڵێن: (هەرچەند پێکچوون زۆر بێت لە نێوان ئەو ژینگەیەی کە منداڵ تێدا دەژی زیاتر بەیەکچوون پەیدا دەبێت لەنێوان ئەو



منداڵانە لە لایەنی رەفتارەوە، هەروەها ژینگەی جیاواز دەبێتە جیاوازی رەفتار ئەگەر بێتو برای (جمك)یش بن.

جگە لە هۆکاری کرۆمۆسۆم هارمۆنات و رژێنەکانیش کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر گەشەکردنی منداڵ، هەروەها (RH) کە جیاوازییە لەنێوان خوێنی دایک و کۆرپەلە، ئەوەش دەبێتە هۆی تێکشکانی خرۆکە سوورەکان و منداڵ گیان لە دەست دەدات، یاخود ئیفلیج دەبێت.

**٢- هۆکاری ژینگە:** بریتییە لە هەموو ئەو روژاندنانەی بەرەورووی تاک دەبێتەوە، هەر لە سەرەتای پیتاندندا هەتاکو لە ژیاندا مابێت، گەرچی هەندێک لە زانایان دەڵێن هەر روژاندنێک ئەگەر بێتو کاردانەوەی نەبێت لەسەر تاک بە ژینگە ناژمێردرێت.

زانایان و پسپۆڕانی بواری دەروونزانی ژینگە دابەش دەکەن بەسەر دوو قۆناغ:

قۆناغی پێش لەدایکبوون (ژینگەی سکی دایک)

قۆناغی دوای لەدایکبوون (جیابوونەوەی لە سکی دایک)

قۆناغی پێش لە دایکبوون لەم قۆناغەدا زانیاری کەم هەیە، وە ئەوەی هەشە زۆر ورد نییە، چونکە لەسەر بنچینە و بنەمای زانستی نییە، ئەوەش لەبەر گەلێک هۆکار لەوانە بوونی کۆمەڵێک بەها، کە یارمەتیدەر نییە زانایان تێدا قووڵ ببنەوە لە توێژینەوە و لێکۆڵینەوەکانیاندا کە پەیوەستە بە کۆرپەوە، هەروەها کەمی لایەنی زانستی و تەکنەلۆژیا کە توێژەر پێویستی پێ دەبێت لە کاتی قۆناغی سکپڕیدا، گەرچی لەو دوایەدا گەلێک پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا هاتۆتە ئاراوە لەو بوارەدا، بەڵام هێشتا پێویستی بە زیاتر هەیە، لە پاشان کارێکی هەروا سووک و ئاسان نییە هەڵسوکەوت لەگەڵ ژیانی کۆرپەلەدا بکەیت، نەوەکو کۆرپەلە تووشی لەبارچوون بێت تووشی نەخۆشییەک بێت، بۆیە لەو بارەدا لێکۆڵینەوەکان زیاتر لەسەر کۆرپەلەی ئاژەڵاندا دەکرێت.

## ئەو هۆكارانەی كار لە كۆرپەلە دەكەن لە سكی دایكدا:

وەكو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ كرد لە دوای پرۆسەی پیتاندن هۆكاری ژینگە دەست پێدەكات، كە كۆرپەلە بەهۆی (ناوكە پەتك)ەوە پێویستییەكانی فسیۆلۆژی خۆی دابین دەكات، كەواتە دایك كاردانەوەی خۆی هەیە لەسەر ژیانی كۆرپەلە بەهەردوو لایەنی باش و خراپییەوە.

**١- نەخۆشی دایكی سكپڕ:** هەرچەندە ولداش (المشیمة) لێ ناگەڕێت هیچ میكرۆبێك لە خوێنی دایكەوە بگوازرێتەوە بۆ كۆرپەلە، تەنها لە هەندێك باردا نەبێت، بەڵام هەندێك لەو نەخۆشییانەی كە دایك تووشی دەبێت كاریگەری و رەنگدانەوەیەكی خراپی دەبێت لەسەر كۆئەندامەكانی كۆرپەلە، بۆ نموونە هەر كاتێك ئافرەتی دووگیان تووشی سورێژەی ئەڵمانی و سووره تا (الحصبة المانیة والحمی القرمزیة) دەبێت، ئەو نەخۆشییانە كاریگەری خۆیان دەبێت لەسەر كۆرپەلە، بۆیە زۆر جار وا دەبێت منداڵ تووشی كوێری دەبێت یاخود كەم پەیبردن (ادراك) دەبێت. جا بۆ ئەوەی دایك یاخود خێزان نەوەیەكی نەخۆش پێشكەش بە كۆمەڵگا نەكات و ئەو كەسە نەبێتە بار بەسەر خەڵك و كۆمەڵگا، پێویستە ئەو كاتە نەخۆش خۆی بەدوور بگرێت لە منداڵبوون.

**٢- خۆراكی ئافرەتی سكپڕ:** گەلێك لە منداڵان كە كەموكوڕی لەشی و عەقڵیان هەیە بەهۆی بەدخۆراكی دایكەكەیانەوەیە كە خۆراكی وەكو پێویست نەبووە لە كاتی سكپڕیدا، ئەو بۆچوونەش ئەوە دەسەلمێنن كە زۆربەی ژمارەی منداڵانی كەم عەقڵ و لەش ناتەواو زیاتر بڵاوە لە وڵاتە هەژارەكاندا، كە كەمی خۆراكیان هەیە.

**٣- زیادەڕەوكردن لەخواردنەوەی مەی و جگەرەكێشان:** لێكۆڵینەوەكانی مەیدانی بواری گەشەكردن ئەوە دەسەلمێنن كە دایكی سكپڕ كە خوی بە ماددە بێهۆشكەرەكانی جگەرەكێشان و دەرمانەوە گرتبێت، كاریگەرییەكی نێگەتیڤانەی دەبێت لەسەر كۆرپەلە بەتایبەتیش شێواوی لەشی و كەمی عەقڵی.

بەڵام خۆشبەختانە ئافرەتی سكپڕ لە كۆمەڵگای كوردەواری دوورە لەو جۆرە كارانە، تەنها ئەوەندە نەبێت كاتێك تووشی نەخۆشی دەبێت دەرمان دەخوات بۆ



چارەسەركردنی نەخۆشییەكەی، ئەویش لە رێگای پزیشكی پسپۆرە، هەروەها (تیشكی X) ئەویش بە هەمان شێوە كاریگەری خراپی دەبێت لەسەر كۆرپەلە بۆیە باشترە ئافرەتی سكپڕ هەتا دەتوانێت خۆی لەو تیشكە بپارێزی، وە هەر كاتێك رێگای كەوتە لای پزیشك پێویستە ئاگاداری بكاتەوە لە سكپڕییەكەی نەوەك دەرمانێك یاخود تیشكی X ی بۆ بگیرێت زیان بە كۆرپە بگەیەنێت، هەروەها بەرەوڕووبوونەوەی ئافرەتی سكپڕ بە هێدمەی دەروونی، هەر كاتێك ئافرەت تووشی شتێكی لەناكاو بێت یاخود هەواڵێكی ناخۆش بەرگوێ بكەوێت وەكو ئەوەی لەناكاو هەواڵی پێ بدرێت كە كەسێكی خۆشەویستی گیانی لە دەست داوە، ئەوە بۆی دەبێتە هێدمەی دەروونی و كاریگەری دەبێت لەسەر كۆرپەلەی ناو سكی.

تەمەنی دایك هۆكارێكی ترە بۆ كۆرپەلە، باشترین و گونجاوترین تەمەن بۆ ئافرەت لەنێوان (٢٠ – ٣٠) ساڵ بێت، بەڵام لەو تەمەنە بچووكتر یاخود گەورەتر، رەنگە كۆرپەلە بەرەوڕووی پەشێوی تەندروستی ببێتەوە و، رەنگە هەندێك جاریش كۆرپەلە لەبار بچێت.

## هۆكاری ژینگەی دوای لەدایكبوون:

منداڵ كاتێك لە دایك دەبێت پاك و خاوێنە وەكو پەڕەی گوڵ هەروەكو دەروونزان (جون لوك) دەڵێت منداڵ كاتێك لە دایك دەبێت لەسەر سروشتی خێر و چاكەیە هەروەها (جان جاك روسو)ش هەر دەربارەی منداڵ دەڵێت: (منداڵ كاتێك دێتە دونیاوە خاوێنە بەڵام كاتێك تێكەڵ بە ژینگە دەبێت، ژینگە بەرەو لایەنی خراپەی دەبات ئەگەر هاتوو ئەو ژینگەی تێدا دەژی نارێك بوو، هەروەها گەر هاتوو ژینگە باش بوو منداڵەكەش باش دەبێت، كەواتە ئێمە كوڕی ئەو ژینگەیەین كە تێدا دەژین.

(واتسن) خاوەنی قوتابخانەی رەفتاری ئەمریكیش هەموو هۆكارەكانی دروستبوونی كەسایەتی بۆ ژینگە دەگەڕێنێتەوە، یەكێك لەو قسە بەناوبانگەی واتسن ئەوەیە كە

دەڵێت: (١٠ منداڵی لەش ساغم بدەرێ چۆنت بوێت وایان دروست دەکەم زانا، دانا، هونەرمەند، دز و جەردە، رێگر... هتد، بێ ئەوەی هیچ حسابێك بۆ رەگەز و جۆری کەسەکە بکەین). کەواتە لای واتسن ژینگە هەمموو شتێکە و بڕوای بەهۆکارەکانی بۆماوەیی نییە و قسەی زانا فسیۆلۆژییەکان رەت دەکاتەوە.

دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان (خێزان، قوتابخانە، گەڕەك و کۆڵان، شوێنە ئایینییەکان... هتد) رۆڵی گرنگ و بەرچاو دەگێڕن لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی منداڵ لە سەرووی هەمووشیانەوە خێزان چونکە منداڵ کە دێتە دونیاوە چاوی لەناو خێزانەکەیدا هەڵدەهێنێ دەکەوێتە بەر کاریگەری خێزانەکەی، هەر لەناو خێزانەکەیدا فێری دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و بەهاکانی ئایینی و کۆمەڵایەتی دەبێت، بەتایبەتی لە تەمەنی (٥) ساڵەی یەکەمی تەمەنیدا، لەو بارەیەوە دەروونزان فرۆید دەڵێت (تەمەنی پێنج ساڵەی یەکەمی منداڵ زۆر گرنگ و هەستیارە بۆ پێکهاتەی کەسایەتی داوڕۆژی منداڵ). منداڵ لەو تەمەنەیدا زۆر کاریگەرە بەدایکی چونکە زۆربەی کاتەکانی خۆی لەگەڵ دایکدا بەسەر دەبات، بەتایبەتی بۆ تێرکردنی پێویستییەکانی فسیۆلۆژی وەکو (خواردن و خواردنەوە و خاوێنکردنەوەی).

ئاستی ئابووری کۆمەڵایەتی خێزان رۆڵێکی گرنگی هەیە لەسەر گەشەکردنی منداڵ، لێکۆڵینەوەکان بە دیاردەخەن ئەو خێزانانەی ئاستی ئابوورییان بەرزە منداڵەکانیان چاکتر و باشتر گەشە دەکەن لە چاو ئەو منداڵانەی کە ئاستی ئابوورییان نزمە، هۆکارەکەشی ئەوەیە لە خێزانەکانی ئاستی ئابووری بەرز بەهۆی خواردنی باش و چارەسەرکردنی زوو پێشوەختە لە کاتی تووشبوون بە نەخۆشییەك توانای زوو چارەسەرکردنیان هەیە، لە هەمان کاتیشدا ئاستی رۆشنبیری خێزان بەهەمان شێوە، گەلێك خێزان هەیە لایەنی ئابوورییەوە باشە، بەڵام لە لایەنی رۆشنبیرییەوە ئاستی نزمە گەلێك گوێ بە منداڵەکەی نادات لە کاتی نەخۆشیدا. بۆ نموونە لە باری خوێنی (Rh)دا کاتێك دایك و باوك جۆری خوێنیان جیاوازە، پێویستە لە کاتی منداڵبووندا بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر دەرزی (ئەنتی بودی) لێ بدرێت بۆ ئەوەی کاردانەوەی خراپی



لەسەر منداڵی دووەم نەبێت، چونکە ئەگەر ئەو دەرزییەی لێ نەدرێت خوێنەکە دەمەیێت و خرۆکە سوورەکان تووشی تێکشکان دەبن ناتوانن وەکو پێویست بە کاری خۆیان هەستن، جا ئەو خێزانانەی ئاستی رۆشنبیرییان نزمە، ئەو مەسەلەیە بە گرنگ وەرناگرن منداڵەکانی دوایی تووشی گەلێك نەخۆشی دەبن و دەبنە بارێکی گران بەسەر خێزان و کۆمەڵگا، هەروەها پێش پرۆسەی هاوسەرگیری هەریەك لە کچ و کوڕ دەبێت پشکنینیان بۆ بکرێت لە لایەنی پزیشکەوە، چاوەڕێی راپۆرتی پزیشك بکرێت و دڵنیابن لە سەلامەتی هەردوولا بۆ ئەوەی نەوەکانیان لەش ساغ بێت، بەڵام هەمدیسان بەهۆی کەم هۆشیاری و رۆشنبیری هەردوولا ئەو پشکنینە فەرامۆش دەکرێت هەندێکجار ئاکامێکی خراپی دەبێت بۆ سەر گەشەکردنی منداڵ.

ژمارەی زۆری و کەمی خێزان دیسان کاریگەرییان هەیە لەسەر گەشەکردن، ئەو خێزانەی ژمارەی منداڵەکانیان کەمە زیاتر گرنگی بە پەروەردە و پەروەردەی تەندروستی و دەروونی منداڵ دەدەن، بۆ نموونە خێزان کاتێك منداڵی یەکەمیان دەبێت زۆر بە تەنگ منداڵی یەکەمەوە لەڕووی گەشەی زمان و گەشەی جوولەیی و جەستەیی و عەقڵییەوە، بەڵام کە ژمارەی منداڵەکانیان زیاد دەبێت، ئەو گرنگییەی بە منداڵی یەکەم دەدرا بە منداڵەکانی دوای ئەو نادرێت لە لایەن دایك و باوك ئەو سەلیقە و توانا و ئارەزووەی بۆ منداڵی یەکەمیان هەبوو بۆ دوای ئەویان نابێت، لە لایەکی دیکەشەوە رەنگە تەمەنی دایك و باوکیش کاریگەری خۆی هەبێت لە لایەکی دیکەشەوە هەر پەیوەندی بە زۆری و کەمی منداڵەوە هەبێت ریزبەندی منداڵەکان منداڵی یەکەم زۆر هی دووەم کەمتر ئیتر بەم شێوەیە.

## گەشەی کۆمەڵایەتی

منداڵ لە کاتی لەدایکبوونیدا بوونەوەرێکی بایلۆجییە، بەڵام بەهۆی کۆمەڵێك لە دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە وەکو (خێزان، قوتابخانە، گەڕەك و کۆڵان، شوێنە ئایینییەکان... هتد) دەبێتە بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی.

خێزان یەکەم دامەزراوی کۆمەڵایەتییە کە منداڵ چاوی تێدا هەڵدەهێنێ و فێری خوورەوشت و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان دەبێت، کەواتە هەموو ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەکان کە مرۆڤ فێری دەبێت وەرگیراوە (مکتسب) لەو ژینگەیەی کە مرۆڤ تێدا پەروەردە بووە.

ساڵی یەکەمی گەشەکردنی منداڵ زۆر هەستیارە و ناسکە لەبەر کۆمەڵێك هۆکار، گرینگترینیان ئەو پەیوەندییەیە کە لەنێوان منداڵ و دایکدا هەیە، یاخود منداڵ و ئەو کەسەی لەجیاتی دایك بە پەروەردەکردنی منداڵ هەڵدەستێت، لە ماوەی ئەو چەند مانگەدا، لە ڕاستیدا هیچ ماوەیەك وەکو ئەو ماوەیە نییە کە منداڵ هێندە پێویستی بە دایك دەبێت و، پشتی پێ دەبەستێت.

کەواتە دیاردەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لەو ماوەیەدا دەبینین زیاتر بەستراوەتەوە بە کەسانی گەورە کە منداڵ پەیوەندی پێیانەوە هەیە، جا ئەو پەیوەندییە لەسەر بنچینەی خۆشەویستی بێت یان بەرژەوەندی هاوبەش، هەروەها پەیوەندی منداڵ لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیدا، سەرەڕای هەموو ئەوانەش منداڵ لە هەموو کاتێك و شوێنێکدا داوای یارمەتی لە خۆی گەورەتر دەکات، چونکە ئەو توانای بەسەر هەموو شتێکدا ناشکێت.

وەڵامدەرەوەکانی (استجابات) کۆمەڵایەتی لەلای مرۆڤ یەکێکە لە گرینگترین شێوەکانی ڕەفتاری کە منداڵ فێری دەبێت لە سەرەتای تەمەنیدا لە ئەنجامی تێکەڵاوی خۆی لەگەڵ دایکیدا لە لێکۆڵینەوەیەکی ئەزموونی بە دیارکەوتووە کە وەڵامدانەوەی کۆمەڵایەتی منداڵ بۆ دایکی یاخود ئەو کەسەی ڕۆڵی دایکی دەبینێ هەڵدەستێ بە گشتاندنی کۆمەڵایەتی.



دەروونزان راینجولد لێکۆڵینەوەیکی لەسەر (١٦) منداڵی تەمەن (٦) مانگی ئەنجام دا کە هەموویان لە دامەزراوێکی منداڵ بەخێوکردن دەژیان، منداڵەکانی کرد بە دوو بەشی یەکسانە (٨) منداڵی یەکەم خۆی سەرپەرشتی دەکردن، هەوڵی دەدا ڕۆڵی دایك زیاتر بێت بۆ منداڵەکان بۆ ماوەی (٨) هەفتە لە دوای یەك، هەر هەفتەی (٥) ڕۆژ و، هەر ڕۆژی (٨) کاتژمێر، ئەو دەروونزانە لە ماوەی خزمەتکردنی ئەو منداڵانە خۆی ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی دەکردن وەکو سەرشووشتن و جلوبەرگ گۆڕین یاری لەگەڵ کردن و بەدەم پێکەنین لەگەڵیان ئەو هەشت منداڵەی لەژێر ئەزمووندا بوون سەرپەرشتی چاکتر و باشتر دەکران و لە هەشت منداڵەکەی تر، کە ئەوان بە شێوەیەکی ئاسایی وەکو خۆیان پەروەردە دەکران.

لە ئەنجام دا بەدیار کەوت هەشت منداڵەکەی کۆمەڵەی یەکەم کە لە لایەن دەروونزانەکەوە سەرپەرشتی دەکرا، زیاتر وەڵامدانەوەی کۆمەڵایەتییان هەیە[1]، ئەوەش ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە هەر کردەیەکی کۆمەڵایەتی کە منداڵ فێری دەبێت لە دایکییەوە یاخود لە کەسە نزیکەکانییەوە ئەو ڕەفتارە لەسەر کەسانی دیکەش دەچەسپێنێ. یەکێك لە شتە گرنگەکانی دونیای منداڵ بۆ گەشەکردنی کۆمەڵایەتی لە ماوەی ساڵی یەکەمی تەمەنیدا بەدیارکەوتن و سەرهەڵدانی زەردەخەنەیە بەرامبەر بە خەڵکانی دەوروپشتی، زۆربەی منداڵان وەڵامدانەوەیان هەیە لە کاتی بینینی خەڵك ئەوەش لە تەمەنی (٣ — ٤) مانگیدا، دەروونزانان جیزل و سپیتز دەڵێن بەڕێژەی ٩٨٪ی منداڵان لە تەمەنی (٦) مانگیاندا زەردەخەنەیان هەیە، بۆ کەسانی دەوروبەر[2].

لێکۆڵینەوەکانی دەروونزانی دەربارەی گەشەکردنی کۆمەڵایەتی وا پیشان دەدەن کە منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا توانای وەڵامدانەوەی هەموو ڕوژاندنەکانی دەرەکی هەیە، کاتێك دەست لە پێیەکانی دەدەین، هەروەها لە کاتی تێکەڵاوی لەگەڵ خەڵکدا،

(١) كونجي سيكولوجية الطفولة والشخصية، ترجمة د. عبدالحميد جابر.

(٢) هەمان سەرچاوە.

کەواتە گەشەکردنی کۆمەڵایەتی منداڵ بەلایەنی کەمەوە دەبێت کەسێك هەبێت بۆ ئەوەی منداڵ لێوەی فێربێت، گەرچی هەندێك جاریش وا دەبێت فێربوونی رەفتاری کۆمەڵایەتی لە هەڵوێستە نا کۆمەڵایەتییەکان روودەدات وەکو ئەو منداڵەی لەگەڵ بووکەکەی خۆی یاری دەکات، خۆی رۆڵی دایك دەبینێت و بووکەکەش رۆڵی منداڵ.

زەردەخەنەی منداڵ بە سەرەتای یەکەم دادەنرێت بۆ گەشەکردنی کۆمەڵایەتی ئەو زەردەخەنەیەش بە (٣) قۆناغدا تێپەڕ دەبێت:-

**زەردەخەنەی یەکەم:** لە خۆیەوە کە ئەو زەردەخەنەیە پێی دەووترێت فسیۆلۆژی کە ئەو زەردەخەنەیە هیچ پەیوەندی بە گەشەکردنی کۆمەڵایەتییەوە نییە، کە منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا بەدیار دەکەوێت، بەتایبەتی لە کاتی شیرپێدانی و هەروەها لە کاتی نووستندا، یاخود لە کاتی گوێ لێ بوونی هەندێك روژاندن یاخود لەو کاتەی دەست لە بنی پێیەکانی ئەدەی (لەنێو کۆمەڵگای کوردەواریدا وا باوە گوایە بەدەم فریشتەوە پێدەکەنێ) چونکە منداڵ لەو تەمەنەدا خاوێنە.

**قۆناغی دووەم:** زەردەخەنەی کۆمەڵایەتی لەخۆوە نییە، ئەو زەردەخەنەیە بە شێوەیەکی گشتی لە کۆتایی تەمەنی دوو مانگییەوە دەست پێدەکات، منداڵ لەو تەمەنەدا بەدەم هەموو کەسێکەوە زەردەخەنە دەیگرێت ئەوانەی دەیناسن و ئەوانەی نایانناسێت، هەروەها زەردەخەنە دەیگرێ بەرامبەر شتە جووڵاوەکان، بەڵام کە تەمەنی گەیشتە چوار مانگی بەدەم شتە جووڵاو و نەجووڵاوەکان زەردەخەنە دەیگرێ.

**قۆناغی سێیەم:** زەردەخەنەی کۆمەڵایەتی لەخۆوە نییە (مرحلة ابتسامة اجتماعية غير تلقائية) لێرەدا منداڵ تەنها بەدەم ئەو کەسانەوە زەردەخەنە دەیگرێ کە دەیانناسێ، وەکو دایك و باوك و خوشك و برا یاخود ئەو کەسانەی پەروەردەی دەکەن، لە هەمان کاتیشدا دوور دەکەوێتەوە لەو کەسانەی ناسراو نین یاخود دەگرێت کاتێك کەسی نەناسراو لێی نزیك بێتەوە.

کەواتە قۆناغی سێیەم زەردەخەنەی کۆمەڵایەتی بەڵگەی مەعریفی بەهێزە کە منداڵ توانای ئەوەی هەیە کەسی ناسراو و نەناسراو لە یەکتری جیا بکاتەوە.



دەروونزانی بەناوبانگ (جان پیاجە) کە زۆر گرنگی بە گەشەکردنی عەقڵی منداڵ دەدات دەڵێت: (ئەو بوونی عەقڵی، کە پێشتر نەیبووە)، یاخود بڵێین ئەو زەردەخەنەی منداڵ دەیگرێ لە تەمەنی (٨) مانگیدا هەنگاوی یەکەمە بۆ ترسان لە خەڵکی نەناسراو، هەر بۆیەش ئەو قۆناغەی ناوناوە بە قۆناغی دڵەڕاوکێ تەمەنی (٨) مانگی کە ئەوە کاردانەوەیەکی نێگەتیڤانەیە لە منداڵ دەردەچێت کاتێك بەرەوڕووی خەڵکی نەناسراو دەبێتەوە لێرەدا کۆمەڵێك هۆکار هەیە کار لە دڵەڕاوکێ منداڵ دەکات[1].

بوونی دایك یاخود ئامادەبوونی دایك لەو شوێنەی کەسێکی نەناسراوی لێیە، چونکە منداڵ کاتێك لە باوەش دایکی دایە هەست بەدڵنیایی دەکات.

ماوەی نزیکبوونەوەی کەسە نەناسراوەکە، هەرچەندە کەسی نەناسراو لە منداڵەکە نزیك بێتەوە هێندە منداڵەکە بەخێرایی تووشی هەڵچوون دەبێت و دڵەڕاوکێ زیاد دەکات، بەڵام بەپێچەوانەوە هەرچەندە لێی دوور بکەوێتەوە هێندە هەڵچوونەکەی کەم دەبێت و دڵەڕأوکێی کەم دەبێتەوە.

ماوەی چوونە دەرەوەی منداڵەکە لەگەڵ دایك و باوکی و تێکەڵاوبوونی لەگەڵ خەڵکانی تردا یاخود هاموشوکردنی لەگەڵ خەڵکانی تردا، ئەوەندە دڵەڕاوکێ کەم دەبێتەوە ئەو ترسەی نامێنێت کاتێك بەرەوڕووی کەسانی نەناسراو دەبێتەوە.

منداڵ هەرچەندە گەورەتر بێت، و زیاتر تێکەڵاوی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان بێت، زیاتر گەشەی کۆمەڵایەتی بەرەو پێشەوە دەچێت، ئەویش لە ئەنجامی ئەو تێکەڵاوییەی لەگەڵ خەڵکانی دەورپشتییەوە زیاد دەکات، بەتایبەتیش منداڵ ئەو کاتەی دەچێتە باخچەی ساوایان و قوتابخانە، زۆربەی لێکۆڵەرەوان لەو باوەڕەدان کە ئامانجە بنچینەییەکانی باخچەی ساوایان و قوتابخانە بریتییە لە پەرەپێدانی هاوسەنگی کەسایەتییە، و لەهەمان کاتیشدا چاککردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتییە، چونکە قوتابخانە دەبێتە وێستگەی بەیەکگەیاندنی کۆمەڵێك منداڵی هاوتەمەنی وەکو یەك کە هەریەکەیان لە ژینگەیەکەوە هاتوون، هەریەکێکیان ژینگەکەیان لە یەکتری

(١) علم النفس الطفولة والمراهقة/ د. فؤاد الهى السيد.

جیاوازە، بەڵام بەهۆی کۆبوونەوەیان لەگەڵ یەکتری هەموو ڕۆژێك بۆ ماوەی چەند کاتژمێرێك وا دەکات ئەو پەیوەندییە لەگەڵ یەکدا بەهێز و پتەو بێت، پاشان ئالووێری کۆمەڵایەتی لەنێوان پەیدا دەبێت.

کەواتە ئەگەر بێتو منداڵ بەهۆی دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان تێکەڵاوی یەکتر نەبن، گەشەکردنی کۆمەڵایەتی منداڵ سنووردار دەبێت.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر (٤٢) منداڵ ئەنجام درا، دابەش کران بەسەر دوو کۆمەڵە، کۆمەڵەی یەکەم ژمارەیان (٢١) منداڵ بوو، کە ئەو منداڵانە لە دایەنگا پەروەردە دەکران، کۆمەڵەکەی تر لە ژمارەیان (٢١) منداڵ بوو لە دایەنگا نەبوون، ئەو منداڵانە هەر هەموویان لە تەمەن و زیرەکی و گەشەی لەش و ئاستی کۆمەڵایەتی و ئابووریدا وەکو یەك بوون، پاش ماوەیەك کە هەردوو کۆمەڵە لەژێر چاودێریدا بوون، بەدیار کەوت کە کۆمەڵەی یەکەم زیاتر کەسانی کۆمەڵایەتین، زیاتر دەتوانن تێکەڵاوی خەڵکان بن، حەز بە سەربەخۆیی خۆیان دەکەن، جەختیش لەسەر خۆیان دەکەن و پشت بەخۆیان دەبەستن حەز بە شت زانینیش دەکەن و گرنگیش بەژینگەی دەوروپشتیان دەدەن، ئەو گۆڕانکارییە هەموو دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەری هێزی کۆمەڵایەتی ئەو کۆمەڵە منداڵە کە لەگەڵ یەکتری گەورە ببوون تێکەڵاوی یەکتری ببوون، بەڵام کۆمەڵەی دووەم ئەو تایبەتمەندییانەیان لێ بەدی نەدەکرا وەکو کۆمەڵەی یەکەم، بەڵکو زیاتر گۆشەگیر بوون نەك کەسانی کۆمەڵایەتی.

ژینگەی کۆمەڵایەتی منداڵ لە گەورەبوون و فراوان بووندایە، لە ماوەی منداڵیدا هەتا دەگاتە تەمەنی چوونی بۆ قوتابخانە، یەکێك لە پرۆسە گرنگەکانی گەشەکردنە بنچینییەکانی فێربوون ئاوێتە بوونییەتی لەگەڵ دەوروپشت و بەهێزکردنی منی بالا (انا اعلی)یە، لایەنگرانی قوتابخانەی دەروون شیکاری لایان وایە کە قۆناغی دوایی منداڵ (الطفولة المتأخرة) ماوەی شاردنەوەی چونکە پاڵنەرەکانی سێکس بەهێزە و حەز بە زانینی سێکسی دەکات کە ئەو حەزە لە منداڵدا هەیە، هەتا لە قۆناغی هەرزەکاری دەوروژێندرێ.



فرۆیدی خاوەنی قوتابخانەی دەروون شیکاری دەڵێت: من (انا) و خود پێکهاتەی کۆمەڵایەتییە، کە منداڵ بەدەستی دەهێنێت ئەویش لە ڕێگەی ژینگەی کۆمەڵایەتی ئەمە لەلایەك و لەلایەکی تریشەوە ویژدان پێکهاتەیەکی دیکەیە لە منداڵ لە دەسەڵاتی خێزانەکەی فێری دەبێت بەتایبەتی لە باوکییەوە.

کەواتە منداڵ هەست بەجیاکەرەوەکانی خۆی دەکات لەناو خێزانەکەی و دەوروپشتەکەی، لەو شتەوە فێری ئەوە دەبێت کە بەرگری لە خۆی دەکات، کە ئەوە دەبێتە سەرەتایەك بۆ سەرهەڵدانی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی منداڵ.

پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی بریتییە لە پرۆسەی گۆڕینی تاك بۆ کەسایەتی، جیاوازی نێوان تاك و کەسایەتیش بریتییە لەوەی کە تاك تەنها پێکهاتووە لە تایبەتمەندییەکانی خود، بەڵام کەسایەتی بریتییە لە مرۆڤێکی کۆمەڵایەتی.

بەو پرۆسەیەش تاك دەبێتە ئەندامێك لە کۆمەڵگایەکی گەورە، بەشدار دەبێت لە چالاکییەکان و ئەرك و مافدا، هەروەها بابەتی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی دەبێتە هۆی فێربوونی کۆمەڵایەتی، فێربوونی کۆمەڵایەتیش بریتییە لە هەموو سیفات و چالاکی و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان لە ڕێگای ڕاهێنانی بەردەوام.

دیاردەی فێربوونی کۆمەڵایەتی لەلای منداڵ لاساییکردنەوەی کەسایەتی باوکیەتی، هەر کاتێکیش باوك لە ماڵ نەبێت، ئەو منداڵە ڕۆڵی دەبینێت، کە ئەوەش فێربوونی کۆمەڵایەتییە.

لە ئەنجامی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی ململانێی نەوەکان دەست پێدەکات، بەتایبەتی لەنێوان دوو شارستانییەتی دابونەریتە کۆمەڵایەتییە جیاوازەکان، کاتێك یەکێك بەهۆی کۆچکردنەوە کۆچ دەکات بۆ وڵاتێکی تر، خاوەنی کۆمەڵێك دابونەریتی وڵاتەکەی خۆیەتی، هەر کاتێك گەیشتە وڵاتەکەی دیکە، ئەوانیش خاوەنی دابونەریتی خۆیانن، لەو کاتەدا ئەو کەسە ناتوانێت بەئاسانی دابونەریتەکەی خۆی دەستی لێ هەڵبگرێت، دابونەریتەکەی دیکە وەربگرێت، یاخود بە ئاسانی بۆی هەزم ناکرێت، لە ئەنجامدا لەنێوان ئەو دوو دابەنەریتە جیاوازە پیاهەڵشاخان ڕوودەدات یاخود یەکێکی

تر لە گوندەوە دێتە شار، یاخود بە پێچەوانەوە ماوەیەکی درێژی دەوێت تاکو فێری ئەو دابونەریتە دەبێت کە بۆی چووە.

ڕەفتاری تاکە کەس لە ماوەی ژیانیدا دەکەوێتە بەر کاریگەری سەردەمی منداڵی، کە ئەو منداڵە لە چ ژینگەیەك پەروەردە کراوە؟ کە ئەو ژینگە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لە دروستبوونی کەسایەتی دوارۆژی، هەر بۆیە لە ڕێگای ژینگەوە دەستنیشانی شێوەی کەسایەتی دەکرێت بەرامبەر بە کەسانی دەوروبەر، پاش ئەو گۆڕانە کە بەسەر کەسایەتی منداڵدا دێت، کاتێك سنووری ژینگەی خۆی بەزاند، بۆ نموونە منداڵ لە سەرەتای ژیانیدا ژینگەی سنووردارە، لەناو چوارچێوەی خێزانەکەیەتی، بەڵام کاتێك گەورە دەبێت دەچێتە دەرەوە و تێکەڵ بە دامەزراوی دیکەی کۆمەڵایەتی دەبێت بۆیە دەکەوێتە بەر کاریگەری ژینگەی هەمەجۆر، هەر ئەوەشە وا دەکات ژینگەی گەورەتر و فراوانتر بێت و ئەزموونی ژیانی زۆرتر بێت.

منداڵ توانای وەڵامدانەوەی هەموو ڕەفتاری کۆمەڵایەتی گەورەکانی هەیە، ئەویش لە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونزان (بهلر) بەدیارکەوت، کە منداڵ لە سەرەتای مانگی یەکەمی لەدایکبوونی دەتوانێت وەڵامدانەوەی دەنگی مرۆڤی هەیە ئەویش لە ڕێگای جووڵاندنی لێوەکانییەوە، هەروەکو بلێی خواردنی دەمژێت، لە مانگی دووەمدا سەری دەجووڵێنێت بەلای ئەو شوێنەی دەنگی لێوە دێت، هەروەها گریانی ڕادەوستێت کاتێك لە باوەشی بکەی، پاشان لە مانگی سێیەمدا زەردەخەنە دەیگرێت کاتێك یەکێك بەدەمیەوە پێبکەنێت، پاشان لە چوار مانگیدا ئەگەر بە تەنها بەجێ بهێڵی دەگرێت، ئیتر وردە وردە لەگەڵ ڕۆیشتنی تەمەنی بەرەو پێشەوە دەتوانێت بەدەستەکانی خواحافیزی لە دایك و باوکی بکات، پاشان دەتوانێت خەڵکی بێگانە لە کەسە نزیکەکانی لە یەك جیا بکاتەوە، لە کەسە بێگانەکان دەترسێت و یاخود دەموچاوی دەشارێتەوە بە دەستەکانی یاخود لە پەنا دایکی خۆی دەشارێتەوە.

خێزان ڕۆڵێکی گرنگ دەگێڕێت لە پرۆسەی پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی، لە ڕێگای ئەو پەروەردەیەی فێری منداڵەکەی دەکات، کام دابونەریت گونجاو و پەسندە لەناو



کۆمەڵگا، کامەشیان پەسند نییە ئەو پەروەردەیەش پەیوەندی بە پلەی ڕۆشنبیری خێزانەوە هەیە، کە ئەو منداڵە لەسەر بنەمای توندوتیژی یاخود نەرم و لەسەرەخۆ پەروەردە دەکرێت.

لێکۆڵینەوەکانی مەیدانی لە بواری پەروەردەی منداڵ جەخت دەکەنەوە لە پەروەردە و پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی کاریگەرییەکی قووڵی هەیە بۆ کەسایەتی منداڵ، بەتایبەتیش منداڵ لە تەمەنی کەمتر لە پێنج ساڵی، ئەویش لەبەر کۆمەڵێك هۆکار لەسەرووی هەموویانەوە منداڵ لەو تەمەنەدا زۆر بە ئاسانی دەکەوێتە بەر کاریگەری کەسانی دەوروبەری، زۆر بە ئاسانیش دەتوانێت شت فێر بێت، کەمی ئەزموونی ژیانی، و کەم توانایی هەردەم پێویستی بە چاودێری کەسانی تر هەیە بەتایبەتی دایك، چونکە دایك لەو ماوەیەدا تەنها هەڵناستێت بە پێدانی خواردنی بەڵکو سۆز و خۆشەویستیشی دەداتێ، هەروەها لەناو خێزانەکەیدا لە خوشك و براکانی دیکەش کاریگەرییان دەبێت، چونکە منداڵ لەوانەشەوە فێری شت دەبێت دەتوانێت سوود لە شارەزایی ئەوانیش وەربگرێت، هەروەها گەڕەك و کۆڵان و قوتابخانە کە ئەوانیش دامەزراوی کۆمەڵایەتین کاریگەری خۆیان هەیە لەسەر گەشەکردنی کۆمەڵایەتی و پێگەیاندنی منداڵ، شوێن و پایەی کۆمەڵایەتی منداڵ لەنێو منداڵانی هاوڕێ ڕۆڵی بەرچاوی هەیە، کە هەر منداڵێك شوێن و پایەی هەبوو لەناو منداڵانی هاوتەمەنی خۆی کاریگەری دەبێت لەسەر ڕەفتار و هەڵسوکەوتی بۆ نموونە کاتێك منداڵێك کۆمەڵێك برای لەخۆی گەورەتری هەبێت شوێنی بەهێز دەبێت لەناو منداڵان لە کاتی هاوڕێتی، هیچ یەکێك لە هاوڕێکانی ناتوانن دەستدرێژی بکەنە سەری ئازاری بدەن بەڵکو بەپێچەوانەوە هاوڕێکانی لێی دەترسێن، کەواتە چەند پشتی بەهێز بێت هێندە ئەمین و سەلامەت دەبێت هەر کاتێك ئەو منداڵە بزانێت کەسێك هەیە لەسەری دێتە وەڵام زیاتر پلەوپایەی بەهێز دەبێت، هەروەها ئەو منداڵانەی شوێن و پایەی کۆمەڵایەتییان بەرزە کەمتر گوێ لە منداڵانی وەکو خۆیان دەگرن، بەڵکو بەپێچەوانەوە فەرمان بەسەر کەسانی تر دەکات و گوێی بۆ شل دەکرێت.

## ڕەفتاری پشت بەخۆ بەستن (الاتكالی)

ڕەفتاری پشت بەخۆ نەبەستن بریتییە لە هەرچی هەڵسوکەوتی منداڵ دەیکات، بۆ ئەوەی سەرنجی دەوروپشتەکەی بۆ لای خۆی ڕابکێشێت، یاخود هەوڵی چاکە لەگەڵ کردنیدا بکەن، و سۆز و ڕێزیان بۆ هەبێت تاکو یارمەتی بدەن.

سەرەتای سەرهەڵدانی ئەو ڕەفتارە هەر لە زووەوە لەلای منداڵ سەرهەڵدەدات، کاتێك منداڵ توانای نییە هەموو پێویستییەکانی خۆی چارەسەر بکات و، لەو حاڵەتەدا پێویستی بە یارمەتی کەسانی لەخۆی گەورەتر دەبێت، داوای یارمەتییان لێ دەکات، و ئەوانیش یارمەتی دەدەن، جا ئەگەر هاتوو ئەو یارمەتیدانە بەردەوام بوون لەگەڵ ئەوەش تەمەنی منداڵەکە گەورە دەبێت، کە دەتوانێت ئەو کارانەی جاران پێی نەدەکرا لەبەر بچووکی تەمەنی یاخود لەبەر نەگەیینی ئەندامەکانی لەشی، بەڵام ئێستا گەورە بووە هیچ پاکانەیەك نییە بۆ ئەوەی کارەکە بەخۆی ئەنجام نەدات ئەوە دەچێتە خانەی پشت بەخۆ نەبەستن، یاخود پشت بە خەڵکی بەستن.

خێزان لەسەرووی هەمووشیانەوە دایك دەستپێشخەرە بۆ سەرهەڵدانی ئەو ڕەفتارە لەلای منداڵ، کاتێك منداڵ دەگاتە (٤ — ٥) ساڵی دایك چاوەڕێی ئەوە لە منداڵەکەی دەکات پشت بەخۆی ببەستێ و کراسەکەی لەبەر بکات، هەروەها لە سەرەتای چوونە قوتابخانەش هۆیەکی دیکە هەیە کاتێك منداڵ دەچێتە قوتابخانە بۆ جل گۆڕین و پێڵاو لەبەرکردن داوای یارمەتی لە خۆی گەورەتر دەکات، و لە کاتی چوونە قوتابخانەش کتێبەکانی بۆ هەڵدەگیرێت کە ئەمانە سەرەتایەکن بۆ پەیدابوونی ئەو ڕەفتارە.

ڕەفتاری پشت بەخۆ نەبەستن بە تەنها پێوەرێك نییە کە گەوران یارمەتی دەدەن، چونکە هەر کاتێك لەناو کۆمەڵگا پێویستی بەهاوکاری و یارمەتی خەڵکانی تر دەبێت، بەڵام هەر کاتێك منداڵ توانای کارکردنی هەبوو، کەچی بڕوای بەخۆی نەبوو کە کارەکەی بکات و چاوەڕوانی یەکێکی دیکە بکات بۆ ئەوەی کارەکەی بۆ بکات ئەو کاتە دەبێتە پشت بە خەڵکی بەستن.



ڕەفتاری پشت بەخۆ نەبەستن زیاتر لە کچان بەدیار دەکەوێت وەك لە کوڕان کاتێك کچێکی تەمەن (٥) ساڵی ئەو ڕەفتارەی تێدا سەرهەڵدەدات، ئەگەر بێتو زەمینەسازی هەبێت بۆ سەرهەڵدانی ئەو ڕەفتارەوە ئەگەر هاتوو بەردەوام بوو دەبێتە هەرزەکارێکی پشت بەخۆ نەبەستوو، دوای تاکێکی پشت بەخۆ نەبەستوو.

دیارە بۆچوونی کۆمەڵگا و ڕۆشنبیری کۆمەڵ یارمەتیدەرن زیاتر بۆ کچان کە ئەو ڕەفتارەیان هەبێت هۆکارەکەشی ئەوەیە کۆمەڵگا ئەو ڕەفتارە لە ڕەگەزی کچ قەبووڵ دەکات، بەڵام لە کوڕ قەبووڵ ناکرێت، بۆیە دەبینین کچان زیاتر تاکی پشت بەخۆ نەبەستوون.

پشت بەستن بە خەڵك هەندێکجار لە ئەنجامی نەمان و بزربوونی بڕوا بەخۆ نەبوونە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵی کە زۆر لە دایکان و باوکان زیاد لە پێویست سۆز و خۆشەویستی دەدەن بە منداڵان و چاوپۆشی لە هەڵە و کەموکوڕییەکانی منداڵەکانیان دەکەن، لەو کاتەدا ئەو منداڵە خۆی دەچەسپێنێ لە بوونەوەرێکی لاواز دەبێتە کەسێکی پشت بەخۆ نەبەستوو، و داوای یارمەتی لە خەڵکی دەکات، کە گەورەش دەبێت ئەو سیفەتە لەگەڵیدا گەورە دەبێت. بۆ نموونە توانای کڕینی کراسێکیشی نییە بۆ خۆی، بەڵکو دەبێت خەڵکانی تر یارمەتیی بدەن، دیارە ئەو سیفەتەش خەڵك لێی قەبووڵ ناکات، وەکو خێزانەکەی لێی قەبووڵ دەکات، لەو بارەشدا ئەو کەسە هەست بەوە دەکات کە تاکێکی سەرکەوتوو نییە لە ژیاندا.

سیفەتەکانی منداڵی پشت بەخۆ نەبەستوو کەمتر ڕەفتاری دوژمنکاری لێ بەدی دەکرێت لەو منداڵانەی کە پشت بەخۆ دەبەستن، هەروەها کەمتر مەیل و ئارەزووی بۆ وەڵامدانەوەی دوژمنکاری هەیە لە چاو منداڵانی دیکە، هۆیەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، لەوە دەترسێ ئەو خۆشەویستییەی کە هەیەتی لەلای خەڵکی لە دەستی بچێت، ئەگەر بێت و ئەو هەڵسوکەوتانە بکات لە کۆمەڵگا قەبووڵی نییە، لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەدیار کەوتووە ئەو منداڵانەی ڕەفتاری پشت بەخۆ نەبەستنیان بەهێزە پلەی سەربەخۆییان کەمە هۆکارەکەی بۆ کەمی چاودێری و سۆزیان هەیە. هەڵبەتە کۆمەڵێك هۆکاری دیکەی ژینگە هەیە لە خێزاندا کە هۆکارن بۆ پەیدابوونی و سەرهەڵدانی ئەو ڕەفتارە، لەوانە تەمەنی منداڵ کە

هۆکاری سەرەکییە بۆ دەستنیشانکردنی پلەی لێبووردەیی کە پەیوەستە بەو رەفتارەوە، بەشێوەیەکی گشتی منداڵی گەورە زیاتر پشت بەخۆی دەبەستێ نەك منداڵی گچکە، هەروەها ریزبەندی منداڵ لە خێزاندا بەشێوەیەکی گشتی دایك و باوك وای بۆ دەچن کە منداڵی یەکەم گرنگی زۆرتر و باشتر بەو منداڵەی یەکەم دەدەن نەك ئەوانی دوای ئەو دێت، پاشان رەگەزی کچ زیاتر رەفتاری پشت بەخۆ نەبەستنیان هەیە وەك لە کوڕان، پاشان بۆچوونی رۆشنبیری کۆمەڵگا جیاوازە لە کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە، بۆ نموونە لە هەندێك کۆمەڵگا هەر کاتێك رەگەزی مێینە ئەو رەفتارەی هەبێت زۆر خەوش (عیب) نییە و لێی بە خەوش ناگیرێت، بەڵام هەمان هەڵسوکەوت گەر رەگەزی نێر بیکات لێی بە عیب دەگیرێ، گەلێك جار وا دەبێت کچ جلوبەرگی کوڕان لەبەر دەکەن ئاساییە، بەڵام ئەگەر بێتو کوڕ جلی کچان لەبەر بکات کۆمەڵگا قەبووڵی ناکات، کەموکوڕی جەستەیی شێوەی دەرەوەی منداڵ هەر کاتێك دایك و باوك هەستی کرد منداڵەکەیان لە رووی جەستەیەوە لاوازە، زۆر پشتی پێ نابەستن، بەڵام ئەوەی لە رووی جەستەییەوە بەهێز بوو کەموکوڕی جەستەیی نەبوو پشتی پێ دەبەستن، چونکە وا هەست دەکەن ئەو جەستەی بەهێزە و توانای ئیشکردنی هەیە، ئەوەی جەستەی بەهێزە توانای ئیشکردنی نییە، پاداش و سزای پەروەردەیی لە کات و ساتی خۆی، پاداش واتە هاندانی منداڵ بۆ ئەوەی بتوانێت سەربەخۆیی خۆی بچەسپێنێ و دوور بکەوێتەوە لە رەفتاری پشت بەخۆ نەبەستن.

بۆ خۆ دوورکردنەوە لەو رەفتارە، پێویستە منداڵ هەر لە زووەوە رابهێنرێت بۆ ئەوەی فێری ئەوە بکرێت پشت بەخۆی ببەستێ، وە چاوپۆشی لە هەڵەکانی نەکرێت و، هەڵەکانی بۆ راست بکرێتەوە، لە هەمان کاتیشدا هانی منداڵ بدرێت کە تۆ خاوەن توانای دەتوانی شتی لەوە گەورەتر ئەنجام بدەی و چاوەڕوانی خەڵکی دیکە مەکە ئیشوکارت لەجیاتی بکات، کەسیش لە تۆ بە تواناتر نییە، بەڵکو بتوانێت پشت بەخۆی ببەستێ، ئەگەر هاتوو کارەکەی ئەنجامی دەدات کەموکوڕی و ناتەواوی تێدا بوو بەسەرخۆیدا نەشکێندرێتەوە، بەڵکو ئامۆژگاری بکرێت و کارە هەڵەکانی بۆ راست بکرێتەوە بۆ ئەوەی جارێکی دیکە ئەو هەڵەی دووبارە نەکاتەوە.



## رەفتاری دوژمنکاری

دوژمنکاری بریتییە لەوەی هەر کردەوەیەك ببێتە مایەی زیان گەیاندن بە خەڵك، یاخود موڵك و سامانی خەڵکی، یاخود گەیاندنی ئێش و ئازار بە خەڵك، جا ئەو ئازار گەیاندنە بە ژیان بێت یاخود بە لەش و جەستە بێت، بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ ئەوە رەفتاری دوژمنکارییە.

شێوازی دەربڕینی رەفتاری دوژمنکاری بەشێوەی راستەوخۆ وەکو لێدان، گاز لێگرتن و شکاندنی بەئەنقەست... هتد بەڵام رەفتاری ناڕاستەوخۆ وەکو دزیکردن و درۆکردن و هەڵاتن لە راستییەکان.

رەفتاری دوژمنکاری تایبەت نییە بە قۆناغێك لە قۆناغەکانی ژیانی مرۆڤ، بەڵکو لە هەموو قۆناغەکانی ژیاندا بەدی دەکرێت.

دەروونزانەکان و پەروەردەکاران گەیشتوونەتە ئەو راستییە لە رەفتاری دوژمنکاری بە روون و ئاشکرایی لە تەمەنی یەكساڵیدا دەست پێدەکات، کە لەو کاتە گۆڕانە بنچینییەکانی ژیانی منداڵ دەست پێدەکات، ئەو رەفتارەش ئەو کاتە رەنگ دەداتەوە کە منداڵ تووشی نائومێدی دەبێت.

فرۆید دەڵێت: (مرۆڤ بەڕێژەیەکی زۆر مەیلی دوژمنکاری هەیە، چونکە رەمەکی لەناوبردن (غریزة الهدم) بەشێکە لە قەوارەی رەمەکی مرۆڤ.

ئەو بۆچوونەی فرۆید لەگەڵ رایەکی دەروونزانی رەفتاری (کوندا لورنز) یەك دەگرێتەوە کە دەڵێت: (هەموو گیاندارێك لە دایك دەبێت رەفتاری دوژمنکاریشی لەگەڵدایە کاتێك لە دایك دەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت بەرگری لەخۆیدا بکات و رەگەزی لە ژیاندا بمێنێتەوە).

زانایانی بایلۆژی لەو باوەڕەدان هۆکار و سەرهەڵدانی ئەو رەفتارە پەیوەندی بە جینات و کۆئەندامی دەمارەکانی مێشکەوە هەیە و لەناخی ناوەوەی مرۆڤ سەرهەڵدەدات، بۆیە ئەگەر ئێمە رێگە لەبەردەم ئەو رەفتارە بگرین ئەوا لە ناوەوەی مرۆڤدا بەڕادەیەکی زۆر کەڵەکە دەبێت، هەر کاتێکیش لە سنووری خۆی دەرچوو بەشێوەیەکی بەهێز و لەناکاودا دەتەقێتەوە.

زانایانی ڕەفتاری لەسەرووی هەموویانەوە (واتسن) کە دامەزرێنەری قوتابخانەی ڕەفتاری ئەمریکییە، پێیان وایە ژینگە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێت لەسەرهەڵدانی ڕەفتاری دوژمنکاری، بە پلەی یەکەمیش خێزان بەرپرسە، چونکە خێزان یەکەم دامەزراوی کۆمەڵایەتییە منداڵ چاوی تێدا هەڵدەهێنێ و خێزان پەروەردە دەکرێت، کاتێك منداڵ هەستی کرد لە لایەن دایك و باوکییەوە خۆشەویست نییە یاخود هەست بکات فەرامۆش کراوە و گرنگی پێنادرێت یاخود دایك و باوك منداڵەکانیان لەسەر ڕەفتاری دوژمنکاری هان دەدەن، چونکە وای بۆ دەچن ئەو ڕەفتارە هۆیەکی پێویستە بۆ سەرکەوتنی منداڵەکانیان لە ژیاندا و چەسپاندنی کەسایەتی منداڵەکانیان.
بۆ نموونە کاتێك خێزان منداڵێکیان هەیە هەرچی سۆز و خۆشەویستییان هەیە دەدەنە ئەو منداڵە، کاتێك منداڵی دووەم دێتە دونیاوە کەمێك لە سۆز و خۆشەویستی منداڵی یەکەم کەم دەکەنەوە و دەیدەنە منداڵی دووەم، لەو کاتەدا منداڵی یەکەم هەست دەکات هاوبەشی بۆ پەیدا بووە و منداڵی دووەم هۆکارەکەیەتی، بۆیە دەبینین منداڵی یەکەم ڕقی لە منداڵی دوای خۆی دەبێتەوەو ڕەفتاری دوژمنکاری بەرامبەر بەکار دەهێنێت بەفێڵی ماچکردن گازی لێ دەگرێت، لەو بارەدا منداڵ تووشی ململانێی بەیەکداچوون و دوورکەوتنەوە دەبێت (صراع الاقدام و احجام) منداڵ دەیەوێت گازی لێ بگرێت بۆ ئەوەی خۆی لەو دوژمنکارییە ڕزگار بکات، بەڵام لە هەمان کاتدا دەترسێت کە ئازاری منداڵەکە بدات سزا بدرێت، بۆیە بەفێڵی خۆشەویستی دەچێتە پێشەوە، هەر کاتێك هەستی کرد کەس دیار نییە ئازاری دەدات و، کۆڵی دڵی خۆی پێ دادەڕێژێت.
لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر کۆمەڵێك منداڵ کرا ڕەفتاری دوژمنکارییان بە ئاشکرا پێوە دیار بوو، لەگەڵ کۆمەڵێك منداڵی دیکە کە ڕەفتاری دوژمنکارییان نەبوو یاخود کەمیان هەبوو، لە ئەنجامدا تێبینی کرا کە ژینگە بەرپرسە لە سەرهەڵدانی ئەو ڕەفتارە بەتایبەتی بەکارهێنانی توندوتیژی لەگەڵ منداڵدا، هەروەها ڕەفتاری دایك و باوك و دوور لە خۆشەویستی و سۆز، بۆیە دەڵێن هەر کاتێك دایك و باوك ڕەفتاری دوژمنکارییان هەبێت منداڵەکانیان هەمان ڕەفتاریان دەبێت.



ململانێی دوژمنکاری لە قوتابخانە و باخچەی ساوایاندا ڕوو لە زیادبوون دەکات، ئەگەر هاتوو شوێنی یاریکردنیان بچووك بێت ژمارەی قوتابیانیش زۆر بێت، چونکە لەو کاتەدا منداڵ دەچێتە ناو ئیشوکاری منداڵێکی دیکەوە، واتە خۆی تێکەڵی ئیشی یەکێکی دیکە دەکات، بەڵام ئەو شوێنەی فراوانە بۆ یاریکردن هەروەها کەلوپەلی یاریکردنیان تێدا زۆرە، سەرپەرشتیکارانیش لە نزیکەوە چاودێری منداڵان دەکەن، ئەوا کەمتر ڕەفتاری دوژمنکاری ڕوودەدات، بۆ نموونە لە دایەنگە منداڵ لە لایەن پەروەردەکارانەوە زۆر چاودێری دەکرێت کەمتر ڕەفتاری دوژمنکاری بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لە قوتابخانە چونکە چاودێری کەمتر دەبێتەوە ئەوا ڕێژەی ئەو ڕەفتارە زیاد دەکات.
منداڵ گەر لە سەرەتای تەمەنیدا نەتوانێت ئارەزووەکانی جێبەجێ بکات تێریان بکات، خێزان ببێتە ڕێگر لەبەردەم ئەو ئارەزووانە، وەکو هەندێك مەرج دەسەپێنێت بەسەریدا، لەگەڵ حەز و ئارەزووەکانیدا ناگونجێت، ئەو مەرج بەسەر داسەپاندنە دەبێتە کۆت و زنجیر دەخرێتە گەردەنی منداڵ لەو کاتەدا منداڵ پەنا بۆ ڕەفتاری دوژمنکاری دەبات، لەو بارەدا ڕەفتاری دوژمنکارییە دەبێتە بەشێك لە تۆڵەکردنەوە، کاتێك ڕێگە بە منداڵ نادرێت یاری بکات لەسەر شەقام وا هەست دەکات زوڵمی لێ کراوە بۆ تۆڵەکردنەوەی ئەو زوڵمە هەڵدەستێت بە شکاندنی کەلوپەلی ماڵ، شاردنەوەی کەلوپەلی دایك و باوك یاخود ئازاردانی خوشك و برای لە خۆی بچووکتر.
باری جەستەیی لەشی منداڵ وەکو کەموکوڕی یەکێك لە ئەندامەکانی لەش، ئەوەش هۆیەکی دیکەیە بۆ سەرهەڵدانی ڕەفتاری دوژمنکاری، ئەو کەموکوڕییانە وا لە منداڵ دەکات هەست بە کەمی خۆی بکات، جا بۆ پڕکردنەوەی ئەو هەست بە کەمی کردنە ڕەفتاری دوژمنکاری ئەنجام دەدات بۆ ئەوەی قەرەبووی ئەو کەمییەی لەشی بکاتەوە.
بۆ زاڵبوون بەسەر ڕەفتاری دوژمنکاری لەلای منداڵانمان، یان هەر هیچ کەمکردنەوەی رادەی ئەو ڕەفتارە پێویستە لەسەر دایك و باوك و مامۆستایان ڕێژەی توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵەکان کەم بکەنەوە، دەست هەڵبگرن لە سزادانی جەستەیی و دەروونی منداڵ، بەڵکو لە ڕێگای ڕێنماییکردنەوە منداڵەکانمان پەروەردە بکەین، هەر

کاتێك ڕەفتاری دوژمنکارییان ئەنجام دا زیانی ئەو دەستدرێژیکردنەی سەر خەڵك بۆیان روون بکرێتەوە و زۆر سەرزەنشت نەکرێن، نەوەکو تووشی پەشێوی دەروونی بن، لە پاشان جۆرە ئازادی و سەربەخۆییەك بۆ منداڵ ڕێك بخەین کە بتوانێت پێویستە فسیۆلۆژییەکانی تێر بکات.
پەروەردەکارانیش لەبەرچاوی منداڵان قسەی ناشیرین و شەڕە جنێو نەکەن، چونکە منداڵ لە ڕێگای ئەوانیشەوە فێری ئەو ڕەفتارە دەبێت.

## منداڵ و بێبەشبوون لە سۆزی دایکایەتی

پرۆسەی گەشەکردنی منداڵ پرۆسەیەکی ئاڵۆز و هەمەلایەنە، هەموو لایەنەکانی کۆمەڵایەتی و عەقڵی و جوولەی و ڕەوشتی... هتد دەگرێتەوە. یەکێك لەو کۆسپ و لەمپەرانەی دەبێتە ڕێگر لەبەردەم گەشەکردنی منداڵ بێبەشبوونە لە سۆزی دایکایەتی، منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا بەشێوەیەکی گشتی پشت بە دایکی دەبەستێت بۆ تێرکردن و جێبەجێکردنی پێویستییەکانی خۆی، کەواتە منداڵ ئەوەندەی لە قۆناغی ساوایەتیدا پێویستی بە دایکی هەیە لە قۆناغەکانی تردا هێندە پێویستی پێ نابێت.
بێبەشبوون لە سۆزی دایکایەتی واتە جیابوونەوەی منداڵ لە دایکی، جا لەبەر هەر هۆیەك وەکو مردن یاخود جیابوونەوەی دایك و باوك (تەڵاق) یاخود بەهۆی سەرقاڵی کارکردنی دایك کە ناپرژێتە سەر ئەوەی لەلای منداڵەکەی بمێنێتەوە بۆ پەروەردەکردنی.
دەروونزان (سبیتز) دەڵێت: نەبوونی پەیوەندی و تێکەڵاوی کۆمەڵایەتی و سۆز لەنێوان دایك و منداڵ کاریگەرییەکی زۆری هەیە لەسەر دواکەوتنی گەشەی توانستی عەقڵی.
کەواتە بوونی پەیوەندی نارێك لە نێوان دایك و منداڵ، یان ئەو کەسانەی هەڵدەستن بە پەرەوەردەکردنی منداڵ هەردەم دەبێتە نارێکی لە گەشەکردن و بەرەو پێشچوونی لایەنی هەڵچوون و سەرهەڵدانی ڕەفتاری ناوێزە، (سبیتز) لە لێکۆڵینەوەیەکیدا هەستا بەتێبینیکردنی ڕەفتاری ئەو منداڵانەی کە ساڵی یەکەمی تەمەنیان دووربوون لە



دامەزراوێکی پەروەردەکردن و دووربوون لە دایکیان و چاودێری باش نەدەکران، بۆی دەرکەوت بەرێژەی ١٥٪ لە نیوەی دووەمی ساڵی یەکەم واتە لە شەش مانگ زیاتر ئەو منداڵانە ڕەفتاری نائاساییان لێ ڕوودەدات وەکو گریانی بەردەوام و کەمی توانستی جوولەیی هەروەها ڕەتکردنەوەی خواردن و خواردنەوە جگە لەوانەش هیچ وشەیەکیش فێر نەبوون.
بێبەشبوون لە سۆزی دایکایەتی شتێکی ڕێژەییە، لە منداڵێکەوە بۆ یەکێکی تر جیاوازە، ئەویش بە کۆمەڵێك هۆکارەوە بەندە، هەرچەندە ماوەی بێبەشبوونەکە زۆر بێت هێندە گەشەی عەقڵی دوا دەکەوێت، هەروەها تەمەنی منداڵیش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر پاشەڕۆژی ئەو منداڵە، پاشان چۆنیەتی مامەڵەکردنی ئەو کەسەی هەڵدەستێت بە پەروەردەکردنی ئەمانە هۆکارن لەسەر ئاییندەی منداڵ، بۆ نموونە هەموو ڕەفتارێکی نائاسایی ئەو کاتە سەرهەڵدەدات کە منداڵ لە دایکی دابڕا، لەم بارەدا دەتوانین منداڵەکە ماوەی لێکدابرانەکە لە سێ مانگ زیاتر نەبێت، بەڵام ئەگەر هاتوو ماوەی بێبەشبوونەکە زیاتر لە پێنج مانگی خایاند ناتوانرێت بە ئاسایی منداڵەکە بگەڕێتەوە دۆخی ئاسایی خۆی بەڵکو خراپی و دواکەوتنەکەی زیاد دەبێت.
بێبەشبوون لە سۆزی دایك زیانێکی زۆر بە کەسایەتی منداڵ دەگەیەنێت بۆ نموونە منداڵ ناتوانێت زەردەخەنە بکات بەرامبەر هیچ ڕووێك، هەروەها ئارەزووی خواردنی کەم دەبێت و گەشەی جەستەیی دوا دەکەوێت و کێشی زیاد ناکات بەرنامەی نوستنی نارێك دەبێت هەست بە ئارامی ناکات، هەروەها ئەم بێبەشبوونە کاریگەری خۆی دەبێت لەسەر ئایندە و پاشەڕۆژی ئەو منداڵە کە تووشی ڕەفتاری دوژمنکاری دەبێت زوو هەڵدەچێت و دیاردەی درۆکردن و دزیکردن و زەرەر و زیان گەیاندن بە کەسانی بەرامبەری و پشت بەستنی بە کەسانی تر.

## سایكۆلۆژیای هەڵچوون

زاراوەی هەڵچوون لە بەكارهێنانی زانستی نوێدا گەلێك مانا و مەبەستی جیاجیا لەخۆ هەڵدەگرێت، وەكو شارەزایی خود كە لە شێوەی دەربڕین بەدیار دەكەوێت، یاخود هەموو گۆڕانە فسیۆلۆژییەكان كە لە دەم و چاودا بەئاشكرا دەخوێنرێتەوە، بۆ نموونە كاتێك مرۆڤی هەڵچوو كەیف خۆشە زەردەخەنە بەسەر لێوەكانییەوە دیارە، یاخود لە كاتی تووڕەبووندا چاوەكانی زەق دەبێت و نێوچەوانی گرژ دەبێت، و هەروەها لە كاتی ترس و دڵەڕاوكێدا لێدانی دڵی زیاد دەكات و ڕەنگی سپی دەبێت، هەندێك جاریش هەڵچوون لە ڕەفتاری جوولەیی مرۆڤدا ڕەنگ دەداتەوە وەكو دەست جووڵاندن و سەر بادان و چەپڵە لێدان... هتد.

زانایانی دەروونزانی پێناسەی جیاجیایان هەیە بۆ هەڵچوون ئەویش بەگوێرەی ئەو گۆشەنیگاییەی بۆی چووینە:

(دریڤر) دەڵێت: (گرنگترین سیفەتە هاوبەشەكانی لەنێوان هەموو ڕێچكە جیاوازەكانی لێكۆڵینەوەی هەڵچووندا ئەوەیە بەبارێكی دەروونی ئاڵۆزە بە دیاردەكانی گۆڕانی جەستەیی دەست پێ دەكا وەكو كۆئەندامی هەناسەدان و زیاد لێدانی دڵ و پاشان دیاردەكانی دەروونی تیا دەردەكەوێ وەكو دڵەڕاوكێ.

بەڵام لای (كانن) هەڵچوون: بریتییە لە بەدواداچوونی سروشتی كە لە مرۆڤەوە دەردەچێت بۆ بەرەوڕووبوونەوەی شتە لەناكاوەكان بۆ نموونە مرۆڤ لە كاتێكی كتوپڕ و لەناكاو هەواڵێكی ناخۆشی پێ ڕادەگەیەنن غەم دایدەگرێت و تووشی هەڵچوون دەبێت، بەڵام وەنەبێت ئەم هەڵچوونە بە بەردەوامی لەگەڵیدا بێت، بەڵكو پاش نەمانی هەواڵەكە هەڵچوونەكەش دەرەوێتەوە و نامینێت، كەواتە پلەی هەڵچوون بەستراوەتەوە بە پلەی ئەو شتە لەناكاوە كە تووشی مرۆڤ دەبێت كاتێك مرۆڤ سووكایەتی پێدەكرێت، بەگوێرەی پلەی سووكایەتی پێكردنەكە كە هەڵدەچێت. هەر كاتێكیش داوای لێبووردنی



لێ كرا ئەم هەڵچوونە نامێنێت، یاخود كەسێكی خۆشەویستی كۆچی دوایی دەكات غەم دایدەگرێت پاش تێپەڕبوونی كات وردە وردە غەمەكە نامێنێت.

(جانیە) پێی وایە كە بۆماوە و ژینگە كاریگەرییان هەیە لە سەرهەڵدانی هەڵچوون كاتێك مرۆڤ ناتوانێت پاڵنەرەكانی خۆی ڕازی بكات، ئەو كاتە هەڵچوون پەیدا دەبێت كە لە ژینگە ناتوانێت پاڵنەرەكانی بەشێوەیەكی گونجاو كۆنترۆڵ بكات. كەواتە پاڵنەر و هەڵچوون پەیوەندییەكی بەهێزیان هەیە، پەیوەندییەكەش ڕاستەوانە هەرچەندە پاڵنەر بەهێز بێت، هەڵچوونەكەش بەهێز دەبێت، كاتێكیش پاڵنەر بێ هێز بوو، هەڵچوونەكەش بێ هێز دەبێت.

قوتابخانەی ڕەفتاری كە دەروونزان (واتسن) ڕێبەرایەتی دەكات بیروڕایان وایە كە هەڵچوون تەنها بارێكی فسیۆلۆژی نییە بەڵكو پەیوەندییەكی زۆری بە ڕۆشنبیری و فێربوونەوە هەیە مرۆڤ لە ژینگەی دەوروپشتی فێری دەبێت (واتسن) هەستا بە تاقیكردنەوەیەك منداڵێك لەگەڵ مشكێك یاری دەكرد بێ ئەوەی هەست بە هیچ ترسێك بكات پاشان واتسن لە پەنایەكەوە سەیری منداڵەكەی دەكرد هەر كاتێك منداڵەكە دەستی لە مشكەكە دەدا، (واتسن) دوو پارچە ئاسنی بەیەك دادەدا و دەنگێكی گەورەی لێ بەرز دەبۆوە، منداڵەكە وای هەست دەكرد ئەو دەنگە ترسناكە بە هۆی دەست لێدانی مشكەكەیە، هەر كاتێكیش دوور دەكەوتەوە دەنگەكە نەدەما بۆیە ترس لەلای منداڵەكە پەیدا دەبوو، یاخود بەمانایەكی تر بڵێین سەرەتای ترسی مشك لەلای منداڵەكە پەیدا بوو، منداڵەكە ئەو ترسەی گشتاند (تعمیم) كرد بەسەر هەموو مشكێك هەر كاتێك مشكی دەدیت دەترسا.

لێرەدا پرسیارێك سەرهەڵدەدا: ئایا منداڵەكە هەستی بە ترس كرد و ڕای كرد و دوور كەوتەوە یاخود بەپێچەوانەوە ڕای كرد و دوور كەوتەوە كە هەستی بەترس كرد؟

(ولیم جیمس) و (كارل لانج) وای بۆ دەچن ئێمە كاتێك هەست بەترس دەكەین، بۆیە لەدەس ترس ڕا دەكەین و دوور دەكەوینەوە، بەڵام (كانون) بەپێچەوانەوە ئەو بۆچوونەی سەرەوە ڕەت دەكاتەوە و دەڵێت نەخێر ئێمە ڕا دەكەین چونكە هەست بە ترس دەكەین.

ئەو تاقیکردنەوەی واتسن وای لە بەشێك لە زانایان کرد کە بڵێین منداڵ لە سەرەتاوە هەڵچوون نازانێت بەڵکو لە ژینگەوە فێر دەبێت، هەروەکو چۆن فێری خوێندن و نووسین دەبێت.

هەڵچوون ئەو کاتە چەکەرە دەکات کاتێك مرۆڤ شتێکی خراپ دەبینێت لە دەوروبەرەکەی و پێی رازی نییە، ئەم هەڵچوونە نێگەتیڤانەیە، بەڵام کاتێك شتێکی باش دەبینێت پێی سەرسام دەبێت و لای خۆشەویست دەبێت.

ئەم بیروبۆچوونەی قوتابخانەی رەفتاری هەموو دەروونزانەکان پێی رازی نین، بەڵکو هەندێکیان لایان وایە هەڵچوون شتێکی رەمەکییە لەگەڵ منداڵدا لە دایك دەبێت، هەروەکو منداڵ بەگریانەوە لە دایك دەبێت، یاخود برسی دەبێت دەست دەکا بەگریان، یاخود تووڕە دەبێت بووکە شووشەکەی دەشکێنێت... هتد.

بەشێوەیەکی گشتی هەڵچوون بە هەموو جۆرەکانییەوە (ترس، تووڕەبوون، خۆشەویستی، زەردەخەنە) زۆر پێویستە بۆ ژیانی مرۆڤ، ژیان بەبێ هەڵچوون هیچ تامێکی نابێت. مرۆڤ تووشی بێ هێزی و خاوی دەکات، بەڵام بەهۆی هەڵچوونەوە ژیان جوولەی تیا دەکەوێت و دەبێتە هۆی درێژەپێدەری ئاوات و پاڵنەرەکانی مرۆڤ، هەر بەهۆی هەڵچوونەوە لە خۆشی و ناخۆشی منداڵ حاڵی دەبین.

## تووڕەبوونی منداڵ

تووڕەبوون هۆیەکە بۆ هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ ژینگەیەکی ترسناك، هەروەها وەڵامدانەوەیەکی لەناکاوە دژە رەفتاریشە بۆ روژاندنی هەموو هەڕەشەیەك لەخۆوە دەگرێت، هەموو جارێکیش لەگەڵ تووڕەبوون کۆمەڵێك گۆڕانکاری فسیۆلۆژی روودەدات لەسەر کەسی تووڕەبوو.

**تووڕەبوونی منداڵ دوو لایەن لەخۆ دەگرێت:**

**یەکەمیان/** ئەو تووڕەبوونەیە کە کەسان ململانێی لەگەڵدا دەکەن و دەیروژێنن و بەدەستی ئەنقەست تووڕەی دەکەن یاخود هەڕەشەیان لێ دەکەن.



**دووەمیان/** ململانێیە لەگەڵ دەروونی خۆیدا کە بێبەش دەبێت لە سۆز و خۆشەویستی لەو کاتەشدا کۆنترۆڵی نامێنێت و تووڕە دەبێت، خۆ هەندێك جاریش وا دەبێت لە کاتی بەرەوڕووبوونەوەی گرفتەکان کە ئاراستەی دەکرێت، بەرامبەر ئەو تووڕەبوونە دەستە وەستان دەبێت بۆ ئاراستەکردنی تووڕەبوونەکەی بەرامبەر خەڵك، تووڕەبوونەکەی دەخواتەوە و دەری نابڕێت، بەڵام ئەو تووڕەبوونە لە دەموچاویدا دەخوێنرێتەوە.

تووڕەبوون شتێکی ڕێژەییە لە منداڵێکەوە بۆ یەکێکی دیکە دەگۆڕێت، کەسی وا هەیە وەکو دەڵێن پشی فراوانە و درەنگ تووڕە دەبێت، بە پێچەوانە کەسانی دیکە هەیە زوو هەڵدەچن و قیچکەیان تەنگە، دیارە هۆکاری بۆماوە رۆڵی خۆی هەیە لەسەر ئەو هەڵچوونە، جا ئەگەر بێتو ئەو کەسانەی هەڵدەچن بە تووڕەبوون پۆلینیان بکەین دەبێتە چوار جۆر:

**یەکەمیان** زوو تووڕە دەبن و زووش تووڕەبوونەکەیان نامێنێت و سارد دەبنەوە، **دووەمیان** درەنگ تووڕە دەبن و زوو سارد دەبنەوە، **سێیەمیان** درەنگ تووڕە دەبن و درەنگیش سارد دەبنەوە، واتە رقەکەیان لە دڵ و دەروونیدا بۆ ماوەیەکی درێژ دەمێنێتەوە، جۆری **چوارەمیان** زوو تووڕە دەبێت و درەنگ سارد دەبێتەوە.

کەواتە جگە لە هۆکارە بۆماوەییەکان کە کاریگەرییان هەیە لەسەر تووڕەبوون، لە هەمان کاتیشدا هەڵچوونی تووڕەبوون شتێکی وەدەست هاتووە (مکتسب) لە ئەنجامی نەهاتنەوەی ئاوات و ئامانجەکانی منداڵ سەرهەڵدەدات و پەیدا دەبێت، یاخود خواستەکانی منداڵ نایەتە جێبەجێکردن، یاخود زەوتکرەنی کەلوپەلەکانی کە یاری پێدەکات، یاخود هێرشکردنە سەری، یاخود بەزۆرپێکردنی کارێك، یاخود بەزۆر دەست پێ هەڵگرتنی لە کارێك کە خۆی حەزی لێیەتی.

دەروونزان (جوداناف) لە لێکۆڵینەوەیەکیدا لەسەر کۆمەڵێك منداڵ لە تەمەنی حەوت مانگیدا هەتا تەمەنی ٧ ساڵی ئەنجامی دا، تێبینی کرد هەندێك دیاردەی تووڕەبوون لە قۆناغەکانی تەمەندا بەدیار دەکەون:

گریان هەر لە سەرەتاوە تاکو دەگاتە تەمەنی چوار ساڵان.
هاوار و قیژەکردن لە سەرەتاوە تاکو دەگاتە تەمەنی سێ ساڵان.
لە کاتی تووڕەبووندا قاچەکانی لە زەوی دەخشێنێ هەتا سێ ساڵان.
بازدان و لێدانی ئەو شتانەی لەژێر دەستیەتی، بە تایبەتی لەلای رەگەزی نێر.
خۆ درێژکردنی جەستەیی لەسەر زەوی هەتا تەمەنی چوار ساڵان[1].

تووڕەبوونی منداڵ گەلێك جاریش وا دەبێت کە کۆت لەسەری دەسەپێنرێت ئەو کاتەش منداڵ هەڵدەستێت بەو کارانەی سەوەرە کە باسمان کرد، ئەوەش بۆ سەرنجراکێشانی خەڵکی دەورەبەری بۆ ئەوەی ببێتە وەڵامدانەوەیەك بۆ تووڕەبوونەکەی تاکو سۆز و بەزەییان پێدا بێتەوە، زیاتریش ئەو جۆرە تووڕەبوونەی منداڵ لە نێوان ١٦مانگی و ٣ساڵی دایە.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر کۆمەڵێك منداڵ ئەنجام درا لەنێوان ١٦ مانگی و ٣ساڵیدا لە کۆتایی لێکۆڵینەوەکەدا بەدیارکەوت ئەو کاتە منداڵان تووڕە دەبن کە یارییەکانیان بەزۆر و بەبێ ویستی خۆیان لێیان دەسێنرێتەوە یاخود لە سەرشوشتنیان و جلوبەرگ گۆڕینیان و فەرامۆشکردنیان و بە تەنها بەجێهێشتنیان[2].

لەلای هەندێك لە زانایانی تر رەمەکی تووڕەبوون پارێزگاریکردنە لە خۆی، روژاندنەکەش بینینی ناحەزەکانیەتی کە دەیروژێنن بەهەر جۆرێك بێت لە جۆرەکان، منداڵی تووڕەبوو وا هەست دەکات ئەگەر تووڕە بێت بەسەریدا زاڵ دەبێت هەروەها بوونی هەر بەربەستێك ببێتە رێگر لەبەردەم ئیشوکاری یاخود بەدەستهێنانی ئارەزووەکانی.

لە کاتی تووڕەبووندا کۆمەڵێك گۆڕانکاری فسیۆلۆژی لە جەستەی مرۆڤدا روودەدات، کە بە ئاسانی لە دەموچاو و کۆئەندامی هەناسەدان و سووڕی خوێن.

١- اسس النفسية للنمو، من الطفولة الى الشيخوخة/ د. فؤاد الهي السيد ص ٢١٣.
٢- هەمان سەرچاوەی پێشوو.



زانا (کانون) لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەسەر ئەو گۆڕانکارە جەستەییانەی لە کاتی هەڵچوون بەسەر زیندەوەراندا دێت.

(کانون) پشیلەیەکی هێنا پشکنینی بۆ کرد بە تیشکی (X) پاش ئەوەی تێر خواردنی کرد، بۆی دیار کەوت کە گەدەی پشیلەکە هیچ خەوشێکی نییە بەرێکوپێکی کاری خۆی دەکات بۆ هەرسکردنی خواردەمەنی.

لە پاشان سەگێکی گەورە و برسی و تووڕەی لەبەردەمی راگرت، تێبینی کرد پرۆسەی هەرسکردنی خۆراك لە گەدە راوەستا بەیەکجاری، هەروەها خوێنبەرەکانی تەسکبوونەوە و تەوژمی خوێن زیادی کرد و کەمی لیك لە دەمی و زیادکردنی رێژەی ئارەقەکردن.

لەلای هەندێك لە زانایانی دیکە هەڵچوون بە هەموو شێوەکانییەوە (خۆشی، تووڕەبوون، ترس) بارێکی شعورییە بە تەواوی، بەڵام لە هەندێك گۆڕانی فسیۆلۆژی رەنگ دەداتەوە، تووڕەبوون لای زانایان دوو سەرە هەندێك جار بە قازانج و هەندێك جاریش بە زیانی کەسەکە کۆتایی دێت.

ناتوانین بڵێین تووڕەبوون لە هەموو کاتێکدا زیانبەخشە، لە هەندێك باردا کە بەناحەق هەستی بریندار دەکرێت و دەستدرێژی دەکرێتە سەر پێویستە تووڕە بێت بۆ ئەوەی پارێزگاری لە خۆی بکات، بەڵام هەندێك جار بە زیانی کۆتایی دێت و پاشان پەنجەی پەشیمانی دەگەزێت.

جا بۆ ئەوەی ئێمە پەنجەی پەشیمانی نەگەزین پێویستە دەستنیشانی هەڵوێستەکانی بکەین هەر هەڵوێستێك دروست بوو جێگای خۆیەتی بەڵام ئەگەر لە جێگای خۆی نەبوو کۆنترۆڵی دەروونی خۆمان بکەین.

جا کە تووڕەبوون پەرچەکردارێکی دەروونی بێت بەرامبەر روژاندنەکان، دەبێت بەشێوەیەکی نەرمونیان و لەسەرخۆ مامەڵە لەگەڵ تووڕەبوو بکەین، نەوەکو توندوتیژ بین، هەروەها وا باشە منداڵ نەبەستینەوە بەشتێك کە حەزی لێ ناکات، لە هەمووی باشتر و چاکتر ئەوەیە هەر کاتێك یەکێك تووڕەبوو دەست و دەم و چاوی خۆی بە ئاوی سارد بشوات، چونکە لە کاتی تووڕەبوون هەرچی بارگەی نێگەتیف هەیە لەژێر

پێستەی مرۆڤ پەیدا دەبێت، کاتێك بە ئاو شوراو بارگەی پۆزەتیڤ و بارگە نێگەتیڤەکانی خاڵی دەکات و لایان دەبات، بەوەش تووڕەبوونەکە نامێنێت.

## ترس و تۆقین

ترس بریتییە لە هەڵچوونێکی زگماکی لەلای مرۆڤ، و بەرهەمی بەیەك هەڵشاخانی منداڵە لەگەڵ شتێکی ترسناك، لەگەڵ ترسەکەش هەندێك گۆڕانی ناوخۆیی بەسەردا دێت وەکو لێدانی دڵ بەخێرایی و هەناسەدانی زۆر، هەروەها روودانی هەندێك گۆڕانکاری لە دەرەوەی مرۆڤ وەکو گۆڕینی دەموچاو وەکو دەڵێن رەنگی سپی بوو یاخود وەکو پەلگە پیازی لێ هات، هەروەها هاوارکردن قیژەکردن، وشەکانیشی بە پچڕ پچڕی لە دەمدا دێتە دەرەوە لە کاتی قسەکردندا.

روژاندنە سەرەتاییەکانی ترسی منداڵ دەنگی بەرزە، وا هەست دەکات لە شوێنێکی بەرزە، پاشان وردە وردە ئەو ترسە زیاد دەکات بەگوێرەی زیادبوونی تەمەنی، بۆ نموونە منداڵ لە سەرەتای تەمەنی لە مار ناترسێت بەڵام هەر کاتێك تەمەنی گەیشتە (٣ - ٤) ساڵان دەترسێت و لێی دوور دەکەوێتەوە و هاوار دەکات.

لە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونزانان (جیرسلید و هۆلمز) بەدیار کەوتووە ترس بەستراوەتەوە بە ئاستی گەینی قۆناغەکانی گەشەکردن وەکو ئەوەی منداڵ لە کۆتایی ساڵی دووەم لە مار ناترسێت، بەڵام لە کۆتایی ٣ ساڵی و سەرەتای چوار ساڵی دەست بەترس دەکات[1].

هەروەها لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەدا کە دەروونزان (هاجمان) ئەنجامی دا، بۆی بەدیارکەوت کە روژاندنی ترس لەلای منداڵ لەنێوان تەمەنی (٢ - ٦) لە ئەنجامی شارەزایی رابردوو پەیدا دەبێت وەکو ترس لە کاتی چارەسەرکردنی لەلای دکتۆر[2]، کاتێك دەرزی لێ دەدرێت یاخود دەرمانی دەدرێتی شارەزایی پەیدا دەکات هەر

١- اسس النفسية للنمو من الطفولة الى الشيخوخة/ د. فؤاد البهي السيد.

٢- هەمان سەرچاوە.



جارێکی دیکە باسی دکتۆر و چارەسەری بۆ بکرێت ئازاری رابردووی دێتەوە بیری و ترسەکە لە لەشی دەنیشێت، یاخود منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا شتێکی ترسناك لە شوێنێکی تاریك دەبینێت، لە دوارۆژیشدا ئەو ترسەی هەر لەگەڵدا دەمینێتەوە، هەروەها خەیاڵ و بیرکردنەوە لە شت ئەوەش هۆکارێکە کە ترس لە دڵ و دەروونی منداڵ زیاد دەکات، بەتایبەتیش کاتێك منداڵ تەماشای هەندێك فلیمی ترسناك دەکات یاخود کەسانی گەورە باس و چیرۆکی ترسناکیان بۆ دەگێڕنەوە، کاتێك بە تەنها دەبن یاخود شەو لە کاتی نووستندا خەیاڵ لەو شتە ترسناکانە دەکەنەوە و دێتەوە بەرچاویان ترس دایاندەگرێت، یاخود گەلێك جار وا دەبێت بەدەم خەوەوە هاوار و قیژە دەکەن لە خەوەکە بە ئاگا دێن.

گەلێك جاریش وا دەبێت ترس لە رێگای رەفتارەوە دەگوازرێتەوە وەکو ئەو دایکەی لە مشك دەترسێت، کاتێك مشك دەبینێت هاوار دەکا و دەقیژێنێ منداڵەکەش ئەو ترسەی لە دایکی وەردەگرێت لێوەی فێر دەبێت، بەڵام تێبینی دەکرێت ئەو ترسە لەلای رەگەزی مێینە هەر دەمێنێتەوە و بەردەوام دەبێت، بەڵام لای رەگەزی نێر لەناو دەچێت.

رەنگە پرسیار بکرێت هۆی ئەوە چییە؟

لێرەدا بۆچوونی کۆمەڵگا رۆڵی سەرەکی دەبینێت، هەر کاتێك تووڕە بوو گەر بێتو لەو جۆرە شتانە بترسێت کۆمەڵگا سەرزەنشتی دەکات، جا لە ترسی ئەو سەرزەنشتکردنە خۆی وا نیشان دەدات کە ناترسێت ئیتر وردە وردە ئەو ترسە نامێنێت وەکو تیۆری لابردن (نظرية انطفاء) دەروونزان پاڤلوف، بەڵام لەلای رەگەزی مێ ئەو سەرزەنشتکردنە نییە کەس باس ناکات بەخراپە بۆیە بەردەوام دەبێت لەسەر ئەو ترسە.

(هاجمان) هەستا بەچاوپێکەوتن لەگەڵ دایکی (٤٠ کور و ٣٠ کچ) کە تەمەنی منداڵەکانیان لەنێوان ٢٣ مانگ و ٧٠ مانگیدا بوو کاتێك دەربارەی ترس پرسیاری

دەکرد خۆیان و منداڵەکانیان لە ئەنجامدا بۆی روون بۆوە کە ترسی منداڵەکان هەمان ترسی دایکەکانە[1]، کەواتە منداڵ ترس لە دایکییەوە وەردەگرێت.
لای زانایانی رەفتاری ئەمریکی لەسەرووی هەموویانەوە (واتسن) لایان وایە ترس شتێکی (مکتسب) وەرگیراوە.
واتسن تاقیکردنەوەیەکی لەسەر (ئەلبوتە بچکۆڵ) ئەنجام دا، ئەو منداڵە مشکی سپی خۆش دەویست و هەردەم لەگەڵیدا یاری دەکرد بێ ئەوەی هەست بە هیچ ترسێك بکات، واتسن لە پەنایەکەوە دانیشتبوو پارچەیەك ئاسن و چەکوشێکی بەدەستەوە بوو هەرکە مشکەکە لە ئەلبورت نزیك دەبۆوە ئەو چەکوشەکەی لە ئاسنەکە دەدا و دەنگێکی گەورەی لێ بەرز دەبۆوە، ئەو تاقیکردنەوەی چەند جارێك دووبارە کردەوە هەتا ئەلبورت وای هەست دەکرد پەیوەندییەك هەیە لەنێوان دەست لە مشکدانەکە و دەنگی ئاسنەکە، یاخود بڵێین دەست لە مشك دانەکە هۆکارێکە بۆ دەنگەکە، هەتا وای لێهات ئەلبورت هەر کاتێك مشکی دەدیت دەترسا بێ ئەوەی دەنگیش هەبێت.
ئەو تیۆرییە بە تیۆری مەرجی پاڤلوف ناسراوە، کە یەکەمجار ئەو هەستا بە دانانی ئەو تیۆرییە پاڤلوف دەڵێت هەر کەسێك کاتی خۆی لە شتێك ترسا بێت ئەو ترسەی لەبیر چۆتەوە، بەڵام لە بێ هەستی ئەو کەسە ئەو ترسە چەسپاوە ئەو ترسە تازەیەش ترسە کۆنەکەی بەبیر دەهێنێتەوە.
دەروونزان واتسن بە تاقیکردنەوەکەی خۆی زیاتر ئەو تیۆرییەی چەسپاند.
لای دەروونزانەکان ئەو تیۆرییەی پاڤلوف واتە تیۆری مەرجی بەهێزتر دادەنێن لە تیۆرییەکەی فرۆید خاوەنی دەروونزانی شیتەلی کە دەڵێت ئەو کەسانەی لە کارەساتێکی ناخۆش دەبینن هەست بە جۆرە سۆز و بەربەرەکانییەکی دەروونی بەهێز دەکەن لەو کاتەدا ناتوانن ئازارە بەهێزەکە قەبووڵ بکەن بەبێ هەستی لە دەروونی خۆیاندا کپی دەکەن، ئەو کاتەش لە ناوخۆی راستەقینە جیا دەبێتەوە بەسەرچاوە و

١- سیکولوجیة الطفولة والشخصیة، کونجي واخرون، ترجمة د. احمد عبدالعزیز و د. جابر عبدالحمید.



هۆیەکی راستەقینە دەنیشێتەوە لە دەرەوەی لەشدا، بەوەش ترسە تازەکە دەتوانێت لەجیاتی ترسە ناوخۆ راستییەکە ئەو کەسە بترسێت.
فرۆید (١٩٠٩) یەکێك لەو حاڵەتانە باس دەکات (هانس) منداڵێکی تەمەن پێنج ساڵ هەر کاتێك ئەسپی بدیتبا دەترسا، و دەیگوت گازم لێ دەگرێت فرۆید بەرێگای دەروونی شیتەلی چارەسەری کرد.
دەڵێت هانس زۆر رقی لە باوکی بوو، گەلێك جاریش بیری دەکردەوە لە باوکی بدات، بەڵام نەدەوێرا، چونکە دەیزانی باوکی بەسەریدا زاڵ دەبێت، لە هەمان کاتیشدا بەربەرەکانی دەروونی لەلای (هانس) دروست ببوو، دەبوایە رزگار بوایە ئەو رزگاربوونەش بەدەربرین نابێت، بەڵکو لە دەروونی خۆی حەشاری دابوو، ئەوەشی بەستابۆوە بە شتێك لە دەرەوەی دەروونی خۆیدا، ئەو شتەش ئەسپەکەیە لە جیاتی باوکی بەڵام پرسیار ئەوەیە بۆچی هانس باوکی لە جیاتی ئەسپ داناوە؟ لە وەڵامدا دەڵێت ترسی هانس لە ئەسپەکە دەتوانێت رابکات بەڵام لە دەست باوکی ناتوانێت[1].
پاڵنەرەکانی ترس تیۆرییەکی دیکە کە منداڵ لەدایك دەبێت لە سەرەتا لە کەوتن و دەنگی بەرز دەترسێت لە تاریکی، ترسەکەش پەیوەندی بە روژاندنەکەوە هەیە هەرچەند روژاندن بەهێز بێت ترسەکە زۆر دەبێت بەپێچەوانەش روژاندن کەم بێت ترسەکەش کەمە.
هەندێك جاریش ترس واتایی (معنوي) دەبێت وەکو منداڵێك لە ئەنجامدانی کارێك دەترسێت لەوەی کە لە کارەکەیدا سەرنەکەوێت.

## تیۆری پاڤلۆڤ و رەواندنەوەی ترس و تۆقین

ئیڤان پترۆڤیچ زانای فسیۆلۆژی رووسی لە ساڵی ١٨٤٩ لە ڤولگا لە دایك بووە، مامۆستا بووە لە ئەکادیمای پزیشکی سەربازی و خەڵاتی (نۆبڵ)ی وەرگرتووە لەسەر ئەو تاقیکردنەوە مەرجیانەی لەسەر ئاژەڵی کردووە، ئەو تیۆرییەی پاڤلۆڤ بە

١- لە کتێبی گرنگترین نەخۆشییە دەروونییەکان/ جەلال خەلەف ژاڵەیی وەرگێراوە.

گەورەترین تیۆری لە قەڵەم دەدرێت بۆ فێربوون، پاشان شووشتنەوەی دەماغ، کەواتە بەیەك بەرد دوو نیشانەی پێکا، باڤلوڤ لە ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کرد و لە گۆرستانی سوور نێژرا.

باڤلوڤ لە تاقیکردنەوەکەیدا سەلماندی هەموو وەڵامدانەوەیك لە تاکە کەسدا دەبێت روژاندنێك هەبێت، جا ئەو روژاندنە دەرەکی بێت یاخود لە ناوەوە، تێبینی ئەوەشی کرد کە پێکهاتەی فەسلەجی مرۆڤ توانای وەڵامدانەوەی بچووکترین روژاندنی هەیە، جۆری روژاندنەکەش ئاستی وەڵامدانەوەکە دیاری دەکات.

پاڤلوڤ سەگێکی هێنا و لە ژوورێکی دانا کە هیچ روژاندنی دەرەکی لێ نەبوو و سەگەکەش لە ئامادەباشیدا بوو، پاشان خواردنی بۆ سەگەکە هێنا، لەگەڵ خواردن هێنانەکە زەنگی بۆ لێ دەدا ئەو تاقیکردنەوەیەی چەند جارێك دووبارە کردەوە، تا سەگەکە گەیشتە ئەو قەناعەتە کە پەیوەندییەك لەنێوان هەردوو حاڵەتەکەدا هەیە، پاڤلوڤ تێبینی ئەوەی کرد هەر کاتێك زەنگ لێ دەدرێ سەگەکە لیك دەرژێنێ، کەواتە زەنگەکە بووە نیشانەی روژاندن و لیك رژاندنیش نیشانەی وەڵامدانەوەیە.

روژاندنی سروشتی (خواردن) ◄—— وەڵامدانەوەی سروشتی (لیك رژاندن)

روژاندنی مەرجی (زەنگ لێدان) ◄—— وەڵامدانەوەی مەرجی (لیك رژاندن)

یاخود منداڵێك دەترسێت لە دەرزی لێدان، بوونی منداڵەکە روژاندنی سروشتییە و دەرزی لێدان دەبێتە روژاندنی مەرجی، ئەو دوو روژاندنە دەبێتە وەڵامدانەوەی سروشتی کە ئازاردانە:

منداڵ + دەرزی لێدان ◄—— ئێش و ئازار و ترس.

کەواتە بۆ نەهێشتنی ترس و رەواندنەوە دەبێت سستی و لاوازییەك هەبێت لەنێوان روژاندنی سروشتی و روژاندنی مەرجی، کەواتە هەرچەندە ماوەی نێوان زەنگ و نەهاتنی خواردەمەنی ئەوە وردە وردە لیك رژاندن نامێنێت لە زەبر و زەنگ.

یەکێك لە یاساکانی باڤلوڤ پەیڕەوی دەکرد یاسای کوژانەوەیە.



بۆ نموونە کاتێك قاز گاز لە منداڵێك دەگرێت منداڵەکە بەدەم ئێش و ئازارەوە هاوار دەکات و دەترسێت:

منداڵ + گازگرتنی قاز ◄—— ترس و ئازار.

روژاندنی سروشتی + روژاندنی مەرجی ◄—— وەڵامدانەوەی سروشتی.

بۆ نەهێشتنی ئەو ترسە جارێك منداڵەکە لە قازەکە نزیك بکەوە، جار لە دوای جار ترس کەم دەبێتەوە، تاوەکو وای لێ دێت ئەو ترسە بە هیچ شێوەیەك نامێنێت.

یەکێکی دیکە لە یاسا و تیۆرییەکەی باڤلوڤ یاسای بە گشتیکردن تعمیم یاخود گشتاندن، کاتێك قازەکە منداڵەکە دەگەزێت، منداڵەکە لە هەموو قازێك دەترسێت وا هەست دەکات هەموو قازێك ئازاری پێ دەگەیەنێت، چونکە وەڵامدانەوەی منداڵەکە بۆ هەموو قازێکە کاتێك یاسای کوژانەوەمان بەکارهێنا لەو ترسە لە کاتی لابردنی ترسەکەش یاسای بەگشتیکردن بۆ رەواندنەوەی ترسە لە هەموو قازێك.

## غیرە

غیرە بریتییە لە بارێکی هەڵچوونی کە مرۆڤ هەستی پێدەکات، غیرە رووێکی دەرەکی هەیە، بەهۆی ئەو رووکارە دەرەکییە دەتوانین هەستی ناوەوەی بخوێنینەوە، بەڵام ئەو کارەش هەروا سووك و ئاسان نییە، چونکە ئەو کەسەی غیرەی هەیە هەردەم هەوڵی شاردنەوەی دەدات.

لای هەندێکی دیکە لە زانایان غیرە پێکهاتووەکی هەڵچوونییە لە تووڕەبوون رق لێبوونەوە و خەم و ترس و دڵەڕاوکێ و رەفتاری دوژمنکاری پێك دێت، ئەو کاتەش روودەدات کە منداڵ هەست بە هەڕەشە دەکات یاخود خۆشەویستی و سۆزی لێ ون بووە، لای هەندێکی دیکە هۆکاری سەرهەڵدانی غیرە هەستی خۆ بەکەمزانینە کاتێك منداڵ هەستی کرد فەرامۆش کراوە یاخود حیسابی بۆ ناکرێت، کەواتە بەهەر شێوەیەك بێت غیرە لە بار و زروفێکی کۆمەڵایەتی سەرهەڵدەدات ئەو زنجیرەیە ئاراستەی کەسێك یاخود کۆمەڵە کەسێك دەکرێت.

مندالّی بچووك هەست بەبوونی غیرەی دەكریّت كاتیّك مندالیّ لە خۆی بچووكتریان هەبیّت گەلیّك جار وا دەبیّت مندالّ قوتابخانە بەجیّدەهیّلیّت و دەگەڕیّتەوە مالّ، چونكە دەزانیّت برا یا خوشكە بچووكەكەی بەدریّژایی كات لە مالّ دەمینیّتەوە لەگەلّ دایكدا، هەروەها لەلای مندالّی بچووك ئەو غیرەیە بەشیّوەی دوژمنكاری بەدیار دەكەویّت، ئەگەر بیّتو ئەو خیّزانە لەڕووی ئەندامەكانییەوە كەم بیّت، بەلاّم لە خیّزانی زۆر بەو شیّوەیە بەدیار ناكەویّت بەلاّم ئەگەر بیّتو مندالّ هەندیّك بەتەمەنتر بوو ئەو رەفتاری دوژمنكارییەی بە سیفەتی بلاّوكردنەوەی درۆ و دەلەسە لە دژی كەسەكە بلاّو دەكاتەوە.

لە لیّكۆلّینەوەیەكی دەروونزان (جودانن) بەدیاركەوتووە مندالّ لە تەمەنی (٧)حەوت مانگیدا نیشانەكانی غیرەی تیّدا بەدیار دەكەویّت، كەواتە راستییەك هەیە دەبیّت هەموو لایەك قەبوولّی بكەین ئەویش ئەوەیە كە غیرە لە هەموو كەسیّك هەیە بەبیّ ئەوەی رەچاوی قۆناغیّك لە قۆناغەكانی بكریّت، بەلاّم بوونی غیرە شتیّكی ریّژەییە لە كەسیّكەوە بۆ كەسیّكی دیكە، جیاوازی هۆكارەكانی پەیدابوون و سەرهەلّدانی غیرە بۆ كۆمەلیّك هۆكار دەگەڕیّتەوە لەوانە كاتیّك خیّزان جیاوازی دەكات لە نیّوان مندالّەكانیان، یاخود بە مانایەكی دیكە بلّیّین بە چاویّكی گەورەتر و خۆشەویستر تەماشای یەكیّك لە مندالّەكان دەكات، جا كە مندالاّنی تر ئەو جیاوازییە دەبینن غیرەیان لەسەر ئەو مندالّە دەبیّت.

كەواتە دەتوانین بلّیین لەو كات و ساتەدا گەورەكان تۆی غیرە لە میّشكی مندالّەكانیان دەچیّنن، هەروەها هەستی خۆ بەكەمزانین، هەروەها كاتیّك هەستی كرد فەرامۆش كراوە لە لایەن بەرامبەرەكەیەوە، پاشان مندالّ شتیّك ون دەكات یاخود لە دەستی داوە، دەیەویّت ئەو شتە بهیّنیّتەوە دەست خۆ بەهەر شیّوەیەك بیّت.

فرۆید دەلّیّت گریّ ئەودیب و ئەكترا رۆلّیان هەیە لە سەرهەلّدانی غیرە لە بۆ دایك و باوكیان، كاتیّك باوك بۆ ماوەیەك لە مالّ دوور دەكەویّتەوە، دایك خەریكی مندالّەكان دەبیّت، بەلاّم هەر كاتیّك باوك گەڕایەوە دایكەكە هەلّدەستیّ بەخزمەتكردنی و گرنگیپیّدانی باوك، لەو كاتە مندالّەكان هەست دەكەن فەرامۆشكراون لە لایەن



دایكەوە بەهەمان شیّوە مندالّ غیرە دەیگریّ بەرامبەر باوك، هەروەها كوڕیّكی تاقانە لەتاو كۆمەلّە خوشكیّك و بە پیّچەوانەوەش، هەر لە بیر و بۆچوونەكانی فرۆید دەربارەی سەرهەلّدانی غیرە ترسە، ترس لە ونبوونی خۆشەویستی هەستكردن بە بیّهیّزی خۆی و رەخنەگرتن لە خودی خۆی.

ریّگاچارەكانی كەمكردنەوەی غیرە ئەگەر بیّتو ئیّمە هۆكارەكانمان هەست پیّ كرد زۆر بەئاسانی دەتوانین ریّگا چارەكانیش بەئاسانی بدۆزینەوە، بۆ نموونە جیاوازی نەكریّت لەنیّوان مندالّەكاندا، هەموویان بەیەك چاو سەیر بكریّت هەر كاتیّك دایك و باوك شتیّكی بۆ یەكیّك لە مندالّەكان كڕی پیّویستە شتیّكیش بۆ ئەوانی تر بكڕیّت بۆ ئەوەی غیرە بەرامبەر یەكتری هەلّنەگرن، هەروەها ریّز و خۆشەویستی بۆ هەموو مندالّەكان وەكو یەك بیّت نەك زیاتر گرنگی بە یەكیّكیان بدەن، ئیّستا ئەو دیاردەیە زۆر بەزەقی دیارە مندالّی تاقانە زیاتر گرنگی پیّ دەدریّت بۆیە ئەوانی دیكە غیرەی بەرامبەر هەلّدەگرن.

## دلّەڕاوكیّ

دلّەڕاوكیّ باریّكە بەسەر دەروونی مرۆڤدا دیّت، دلّەڕاوكیّ جۆرە هەلّچوونیّكە وەكو ترس وایە، هەردووكیشیان پەیوەندی بەهیّزیان لەگەلّ یەكدا هەیە، و دژی كاریّكی ترسناكن، بەلاّم ئەوەندە هەیە شتە ترسناكەكە هەلّچوونی ترسدا دیار و ئاشكرایە، وەكو ئەو مندالّەی لە گیانلەبەریّك دەترسیّت، بەلاّم لە ئەو شتە دیار و ئاشكرا نییە، یاخود دیارە بەلاّم مەترسی و زیانەكەی بەو شیّوەیە نییە، وەكو ئەو قوتابییەی لە كاتی تاقیكردنەوەدا دەكەویّتە دلّەڕاوكیّیەوە.

دیاردەكانی دلّەڕاوكیّ بەشیّوەیەكی گشتی ئەوەی تووشی هەست بە نائارامی دەكات و دلّتەنگە و خەم و پەژارە و وەڕسی دایدەگریّت و پەلوپۆلی سارد دەبیّت لە ئیشكردن و ئارەق دەردەدات و خواردن و خواردنەوەی بۆ ناخوریّت و خەو دەزریّت.

دەروونزان (ئەدلەر) دەڵێت سەرچاوەی دڵەڕاوکێ لە مرۆڤدا دەگەڕێتەوە بۆ هەست نەکردن بە هێمنی و ئاسایش، ئەو هەست بەئاسایش نەکردنەش دەگەڕێتەوە بۆ ناتەواوی لەشی گەشەی وەستاوە، یاخود گەشەی تەواوە بەڵام کارەکەی بەئاسانی ئەنجام نادات، یاخود دوای لەدایکبوونی ئەو کەسە بە تەواوەتی ئەندامەکانی لە کار وەستاوە.

لە سەرەتادا ئەدلەر هەرچی ناتەواوی ئەندامەکانی لەشی مرۆڤ هەبوو بە ناتەواوی دادەنا، بەڵام لەدواییدا ناتەواوی دەروونی و کۆمەڵایەتیشی خستە پاڵیان، و دەڵێت دڵەڕاوکێ کاتێك تووشی مرۆڤ دەبێت، کە هەست بە ناتەواوییەك بکات[1].

(ولیم جیمس) ئەو رایە پەسەند دەکات کە دەڵێت دڵەڕاوکێ پەرچەکردارێکی زگماکییە بۆ شتێکی دەستنیشانکراو کە چاوەڕێ دەکرێت رووبدات یاخود روونەدات لە ئەو شتەی لێی دەترسێت، بەڵام (واتسن) تەواو پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی (جیمس)ە، بەشێوەی ئەزموونی سەلماندوویەتی کە ترسی مرۆڤ لە شتێکی دیاریکراو پشت بە ئەزموون دەبەستێت لەگەڵ فێربوونی مەرجی باڤلوڤ، دڵەڕاوکێ دیاردەیە چونکە هەموو کەسێك تووشی دەبێت، بەڵام دیارە ئەوە شتێکی رێژەییە لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی دیکە جیاوازە، جگە لەوەش کەسانی ئەوتۆ هەیە بەکەمترین شت بەرەوڕووی دڵەڕاوکێ دەبێتەوە، یاخود بڵێین هەردەم دڵەڕاوکێی لەگەڵ دایە، کەچی هەندێکی دیکە کەمتر ئەو دیاردەی پێوە دیارە.

وەکو لە پێشەوە گوتمان بارێکی دەروونییە لە شتێکی نادیار دەترسێت، هەر کاتێك ئەو شتە بەسەرچوو دڵەڕاوکێیەکەی نامێنێت، منداڵ تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت هەر کاتێك دایکی لێی دوور بکەوێتەوە، وەکو دەڵێین ئەو دۆزەخەی منداڵ لێی دەترسێت دابڕانیەتی لە دایکی کە تووشی دڵەڕاوکێی دەکات، بەڵام هەرکاتێك دایکی هاتەوە لای دڵەڕاوکێیەکەی نامێنێت.

١- گرنگترین نەخۆشییە دەروونییەکان، جەلال خەلەف ژاڵەیی.



هەروەها دڵەڕاوکێ یەکێك لە گیروگرفتەکانی قوتابییانە بەدەستییەوە دەناڵێنن بەتایبەتی لە کاتی تاقیکردنەوەدا، گەرچی هەندێك جار دڵەڕاوکێ شتێکی پێویستە دەبێت هەبێت، بۆ نموونە قوتابی ئەگەر دڵەڕاوکێی نەبێت هەوڵ و کۆشش ناکات، بۆیە ئەگەر قوتابی دڵەڕاوکێی نەبوو دەبێت بۆی دروست بکەین، بەڵام هەتا سنوورێکی دیاریکراو، چونکە ئەو سنوورە ببەزێنێت بە زیانی ئەو کەسە دەشکێتەوە.

(جۆن مۆبلر) لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەدیاری خست ئەو کەسەی دڵەڕاوکێی زۆرە کەمتر شت وەردەگرێت، لەو کەسەی دڵەڕاوکێی نییە یاخود کەمی هەیە.

لای لێکۆڵەرەوانی دەروونزانی یاسایەك هەیە بەناوی یاسای (بریکس- دودسون) ئەو یاسایە دەڵێت لە هەموو بارێکدا پەیوەندی هەیە لە نێوان پاڵنەر و جێبەجێکردندا، هەر کاتێك دڵەڕاوکێ نزم بوو جێبەجێکردنیش نزم دەبێت، وە هەتا دڵەڕاوکێ بەرز بێت جێبەجێکردنیش لەگەڵیدا بەرز دەبێت، بەڵام هەروەکو گوتمان هەتا سنوورێکی دیاریکراو، ئەگینا ئەو دڵەڕاوکییە زیانی دەبێت کە دڵەڕاوکێ بەرزبۆوە جێبەجێکردنی زیانی دەبێت.

دەروونزانەکان گەلێك دەستوور و یاسایان داناوە بۆ لەناوبردنی ترس و دڵەڕاوکێ، لە هەمووشیان بەناوبانگتر یاسایەکانی دەروونزانی رووسی (ئیڤان پترۆفیچ باڤلوڤ)ە وەکو یاسای کوژانەوە و گشتاندن لە ترسی باسکراوە.

بەڵام دەتوانین بڵێین دڵەڕاوکێ هەرچەند گرنگیی پێ بدەی ئەوندە دڵەڕاوکێ زیاد دەکات هەرچەندەش فەرامۆش بکەی ئەوەندە بێ هێز دەبێت.

## گەشەی جەستەیی

گەشەکردنی جەستەیی بریتییە لە کۆمەڵێك گۆڕانکاری بەردەوام لە پێکهاتەی جەستەیی، مرۆڤ بە بەردەوامی لە گۆڕانکاری و گەشەکردن دایە، ئەو گۆڕانکاری گەشەکردنە دوو شێوەی هەیە، یەکێکیان گشتییە کە بریتییە لە خێرایی گەشەی لەش

بەدرێژایی تەمەنی، ئەوی دیکە بریتییە لە گەشەکردنی ساڵانە، ئەو گۆڕانکارییە دەگۆڕێت بە گۆڕانی جۆری گەشەی لەشی.

گەشەکردنی جەستەیی دەگۆڕێت لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە، واتە هەندێك قۆناغ گەشەکردنی جەستەیی تێدا خێرایە، بە پێچەوانەوە لە هەندێك قۆناغی دیکە لەسەرەخۆیە. بۆ نموونە گەشەکردنی جەستەیی لە قۆناغی کۆرپەیی لە سکی دایکدا بەخێراترین قۆناغ دادەنرێت لە ژیانی مرۆڤدا، چونکە کۆرپە لە سکی دایکدا لە شانەیەکی یەك خانەیەوە گەشە دەکات کێشی دەگاتە ٣,٥ کغم، هەروەها درێژییەکەی دەبێتە نزیکەی ٤٥ سم[1]، ئەو بەشێوەیەکی گشتی ئەگەر بێتو دایك لە بارێکی ئاساییدا بێت، بەڵام هەندێك جار وا دەبێت کێشی لەش و درێژی باڵا کەم و زیاد دەکات، ئەوەش پەیوەندی بە دایکەوە هەیە وەکو باری تەندروستی دایکەکە و هەروەها جۆری ئەو خواردنەی دایك دەیخوات، گەلێك جار وا دەبێت دایك تووشی بەدخۆراکی بووە، منداڵەکەش بەشێوەیەکی راستەوخۆ کاری تێدەکات، چونکە منداڵ بەهۆی ناوکە پەتك خواردن و ئۆکسجین لە دایکییەوە وەردەگرێت، لێکۆڵینەوەکانی زانستی سەلماندوویانە ئەو منداڵانەی تازە لە دایك دەبن لەو خێزانانەی کە دەوڵەمەندن و پلەی هوشیارییان بەرزە کێشیان زیاترە و تەندروستیشیان باشترە لەو منداڵانەی لە خێزانە هەژارەکاندا لە دایك دەبن، ئەوەش بەهۆی باشی خۆراك و چاودێریکردنی خۆیان لەژێر چاودێری پزیشکی تایبەتییەوە.

منداڵ بە شێوەیەکی گشتی بە هەردوو رەگەزەوە (نێر و مێ) لە رووی درێژی باڵایانەوە بەبێ جیاوازی گەشە دەکەن، لە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونزان (بولدوین)دا دەڵێت منداڵ کە لە دایك دەبێت درێژی باڵای (٥٠ سم) هەر مانگێك ٢ سم زیاد دەکا و باڵای درێژ دەبێت، کەواتە لە کۆتایی ساڵی یەکەم ٢٤ سم زیاد دەبێت و باڵای دەبێتە ٧٤ سم، پاشان وردە وردە درێژی باڵای کەم دەبێت، لە کۆتایی ساڵی سێیەم ١٠ سم زیاد

١- علم النفس النمو/ د. مصطفی فهمي.



دەکات و دەگاتە ٨٤ سم، دوایی دەبێتە ٧ سم و پاشان لە ساڵی شەشەم کەم دەبێتەوە بەرێژەی یەك ساڵ (٥سم)[1]، دەبێت هۆکاری بۆماوەش لەبیر نەکەین کاریگەری هەیە لەسەر کورت و درێژی باڵای منداڵ، هەروەها جیاوازی نێوان رەگەزی نێر و مێ، لە سەرەتاوە رەگەزی نێر باڵای درێژترە لە رەگەزی مێ هەتا سەرەتای قۆناغی هەرزەکاری و پاشان پێچەوانە دەبێت.

کەواتە دەتوانین بڵێین خێرایی گەشەی لەشی منداڵ دەگۆڕێت بەگوێرەی تەمەنی منداڵ قۆناغەکانی بە ساڵ و مانگ، ئەو منداڵەی سەرەتای ژیانی بەخێرایی گەشەی کرد هەروا بەخێرایی دەڕوا هەتا دەگاتە قۆناغی هەرزەکاری.

گەشەی جەستەیی لەڕووی کێشەوە، کێشی کوڕان بەشێوەیەکی گشتی لە کێشی کچان زیاترە ئەگەر هەردوولا بەشێوەی ئاسایی پەروەردە بکرێن، بەڵام منداڵ پاش ئەوەی لە دایکی جیا دەبێتەوە گەشەکردنەکەی دەوستێتە سەر هۆکاری ژینگەکە ئەو منداڵە چۆن پەروەردە دەکرێت؟ ئەگەر هاتوو تەندروستییەکی باشی هەبوو تووشی بەدخۆراکیش نەبێت بەرێکوپێکی گەشە دەکات، وە ئەگەر خۆراکی خراپ بوو و تەندروستی ساغ نەبوو منداڵەکە وردە وردە لە کەمی دەدات.

منداڵ لە سەرەتای لەدایکبوونیدا ریشاڵەکانی ماسولکە بچووکە و لاوازە بەگوێرەی تەمەنەکەی، بەڵام لەگەڵ پێشەوەچوونی تەمەنیدا ماسولکەکانی لەشی گەشە دەکەن، بەتێکڕای خێرایی بەرێژەی ٧٥٪ زیاد دەکات لە تەمەنی (٥) ساڵیدا، پاشان بەشێوەیەکی هاوسەنگ گەشە دەکات لەگەڵ گەشەی لەشی هەر ئەو گەشەکردنەی ماسولکەکان وا دەکات منداڵ لە سەرەتادا توانای دانیشتنی هەبێت و پاشان راوەستان لەسەر قاچەکانی، پاشان وردە وردە دەست بە رۆیشتن دەکات، هەروەها لە سەرەتادا توانای گوتنی شتی هەیە پاشان دەتوانێت ئەو شتە هەڵبگرێت، دەبێت ئەوەمان لەبیر نەچێت ژمارەی ماسولکەکانی لەشی مرۆڤ زیاد

١- الاسس النفسية للنمة، د. فؤاد الهی السید.

نابن، بەڵام گەورە و بەهێز دەبن بەپێچەوانەی گەشەی ددانی منداڵ، منداڵ لەسەرەتای تەمەنیدا ددانی نییە، تەمەنی گەیشتە ساڵەوەختە دەست بەدرهاتنی ددانی پێشەوە و بەشی خوارەوەی دەکات، پاشان ددانەکانی تریش دەردەچن، هەڵبەتە هۆکاری بۆماوەش کاریگەری خۆی هەیە لەسەر گەشەکردنی ددانی منداڵ، هەروەکو هۆکاری ژینگەش رۆلی خۆی دەبینێت.

لەو تەمەندا منداڵ سەری لە هەموو ئەندامەکانی دیکەی لەشی گەورەترە، ئەگەر بێتو دەموچاوی بەراورد بکەین لەگەڵ سەریدا گونجاو نییە و شانەکانی زیاد گەورەن ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ قاچ و دەستەکانی، کەواتە منداڵ لە هەموو تەمەنیدا لە ئاستێك نامێنێت بەڵکو هەردەم گۆڕانی بەسەردا دێت پاشان وردە وردە باریك دەبێت.

ئەو هەموو گۆڕانکارییانە بەسەر منداڵدا دێت لە کەم و زیادی گەشەی منداڵ، گەلێك جار دایکان و باوکان تووشی دڵەڕاوکێ دەکات، کەچی پێویست بە دڵەڕاوکێ ناکات، چونکە گەشەی جەستەیی منداڵ لەڕووی فسیولۆژییەوە وا پێویست دەکات، کە منداڵ لە باری ئاسایی خۆیدا بەشێوەیەکی رێکوپێك گەشە دەکات، بەڵام کاتێك تووشی نەخۆشی دەبێت وەك (رشانەوە، سکچوون) سەیر دەکەین گەشەی رادەوەستێ هەندێك جاریش گەشەکردنەکە بەرەو دواوە دەبات، زۆرجار گوێمان لە دایکان دەبێت و دەڵێن (منداڵەکەم بەو نەخۆشییە توایەوە).

دیاردەکانی دەروونیش کاریگەرییان هەیە لەسەر گەشەی جەستەیی ئەو منداڵەی زۆر دەگرییێن تووشی پەشێوی دەروونی و هەڵچوون دەبن کار لەسەر گەشەیان دەکات، هەروەها ئەو منداڵانەی دوور و بێبەشن لە سۆزی دایکایەتی و دوورن لە باوەشی گەرمی دایکیان لەلای یەکێکی تر پەروەردە دەکرێن وەکو پێویست تێر ناکرێن لە سۆزی دایکایەتی کار لەسەر گەشەکردنیان دەکات گەر بێتو لەگەڵ هاوتەمەنەکانیان بەراورد بکرێن بە روون و ئاشکرا هەستی پێدەکرێت کە گەشەیان دواکەوتووە، هەروەها جۆری خۆراکیش هۆیەکی دیکەیە لەسەر گەشەکردنی جەستەیی.



## گەشەی جووڵەیی

گەشەی جوولەیی بریتییە لە پرۆسەی کۆنترۆڵکردن لەسەر هەموو جوولەکانی لەش لە ماوەی ئەنجامدانی ئەو چالاکییە رێکوپێکانەی کە ناوەندی دەماری (المراكز العصبية) مێشك و ماسوولکەکان و بنەما جوولەییەکان ئەنجامی دەدەن، وەکو رۆیشتن و راکردن و گاگۆلکێ... هتد).

گەشەی جوولەیی لایەنێکی گرنگە لە پەرەپێدان و پێشکەوتنی کەسایەتی منداڵ، چونکە منداڵ لە کاتی گەشەکردنی جوولەیی یارمەتیدەرێکی باشە بۆ گەشەی تەندروستی لەلای منداڵ ئەویش لە کاتی راهێنانی منداڵ هەروەها یارمەتی منداڵ دەدات بۆ وەدەستهێنانی سەربەخۆیی خۆی کە بتوانێت پشت بەخۆی ببەستێ لە کاتی ئەنجامدانی چالاکییەکانی رۆژانەی کە ئەوەش دەبێتە مایەی خۆشی بۆ منداڵەکە و رازیبوون لەو هێزە زیادەی کە هەیەتی، زۆر جاران گوێبیست دەبین لە دایکان و باوکان کە منداڵەکانیان زۆر دەجووڵێنەوە ئۆقرە ناگرن و جوولەی زۆر دەکەن و نازانن راوەستان و دانیشتن چییە؟ منداڵ لەو تەمەنەدا هێزێکی زۆری هەیە دەیەوێت خۆی رزگار بکات لەو وزە زۆرەی کە هەیەتی ئەویش لە رێگای جوولەوە خۆی رزگار دەکات، کەواتە گەر هاتوو منداڵێك جوولەی نەبوو ئەوە بە منداڵی نائاسایی دادەنرێت.

سەرەتای گەشەکردنی جوولەی منداڵ بە دەمارەکانی دەم و چاو و ملییەوە دەست پێدەکات، لە سەرەتای تەمەنی سێ مانگییەوە، منداڵ چاو دەگێرێت بە جیهانی دەوروپشتی پاش گەشەکردنی دەمارەکانی چاوی، منداڵ دەتوانێت بەدوای ئەو دەنگەدا بگەڕێت لە جیهانی دەرەکی بۆی دێت دەتوانێت چاو بەلای راست و چەپیدا بگێرێت.

کەواتە پەیوەندییەکی پتەو و بەهێز هەیە لەنێوان گەشەی جوولەیی و هەستەکاندا، ئەوەش بەگوێرەی بۆچوونەکانی دەروونزان (چان پیاجە) کە قۆناغەکانی گەشەکردنی بۆ چەند قۆناغێك دابەش کردووە، یەکەمین قۆناغ قۆناغی منداڵی ناو لانك ناوی ناوە گەشەی هەستی جوولەیی.

منداڵ لەو تەمەنەدا کاتێك بە هەستی بیستن گوێی لە دەنگێك دەبێت، چاوەکانی دەجووڵێنێت بەرەو ئاراستەی ئەو شوێنە کە دەنگەکەی لێوە هاتووە، یاخود ئەگەر دەمارەکانی ملی بەهێزبوون ملی دەسووڕێنێت بەرەو ئەو شوێنەی دەنگەکەی لێوە هاتووە، پاش تێپەڕبوونی شەش مانگ بەسەر تەمەنی منداڵ دەتوانێت قۆڵ و باسکەکانی بجووڵێنێتەوە بەرامبەر ئەو کەسەی کە تەماشای دەکات لە هەمان کاتیشدا دەتوانێت بە پەنجەکانی شت بگرێت و دەستی بەرز بکاتەوە و بیخاتە دەمیەوە و دوایی دەست بە پەنجە مژین دەکات بەوە دەم و لێو و زمانی دەست بە جوولە دەکات، پاشان منداڵی تەندروست باش دەتوانێت لەو تەمەنەدا دابنیشێت بەبێ یارمەتی هیچ کەسێك، لە تەمەنی هەشت مانگیدا بە یارمەتی خەڵکی دەتوانێت هەستێتە سەر پێ و خۆی بەشتەوە بگرێت لە نۆ مانگیدا دەتوانێت گاگۆڵکێ بکات لە دە مانگیدا دەتوانێت بەهۆی ڕەورەوە بڕوات لە یازدە مانگیدا بە تەنها دەتوانێت هەستیتە سەرپێ و بەبێ یارمەتی خەڵکی، لە تەمەنی یەك ساڵیدا دەتوانێت بەسەر پەیژە بکەوێت بەشێوەی گاگۆڵکێ و لە تەمەنی سێزدە چواردە مانگیدا دەتوانێت بڕوات، بەمەرجێك ئەگەر بێتو منداڵ بەرەوڕووی هیچ نەخۆشییەك نەبێتەوە، هەروەها جۆری خواردنیش ڕۆڵی گرنگ دەگێڕێت لە گەشەکردنی جوولە لەلای منداڵ. بۆ نموونە کەمی ڤیتامین و کەمی پرۆتین دەبێتە هۆی دواکەوتنی گەشەی جوولەیی لەلای منداڵ.

لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەسەلمێنن منداڵان لە خێزانە دەوڵەمەندەکان باشتر و چاکتر گەشە دەکەن وەك لە خێزانە کەم دەرامەتەکان، ئەوەش بەهۆی خواردنی باش و زۆری ڤیتامین و پرۆتین، لێکۆڵینەوەکە ئەوە دەسەلمێنن کە منداڵی (٥٠) ساڵ لەمەوپێش گەڕ بە پازدە مانگ بەسەرپێ کەوتبێ، منداڵی ئیمڕۆ دەتوانێت بە دوازدە مانگ بەسەر پێ بکەوێت و بڕوات بەبێ یارمەتی هیچ کەسێك ئەوەش بەهۆی خواردنی باشەوەیە.

گەیین (نضج) کاریگەرییەکی باشی هەیە لە گەشەی جوولەیی جگە لە مەشق و ڕاهێنان، بەڵام بەبێ گەیین ئەو مەشق و ڕاهێنانە ئەنجامی نابێت.



دەروونزان (هیلجرد) کۆمەڵە منداڵێکی هێنا کە تەمەنیان دوو ساڵ بوو، دابەشی کردن بەسەر دوو کۆمەڵە، کۆمەڵەی یەکەم ڕاهێنانی پێکردن لەسەر داخستنی قۆپچەی کراسیان بۆ ماوەی ساڵێك، بەڵام کۆمەڵەی دووەم ڕاهێنانی پێ نەکردن لە ئەنجامدا تێبینی کرد جیاوازییەکی ئەوتۆ لەنێوان هەردوو کۆمەڵەدا نییە، بەڵام پاش ئەوەی تەمەنیان گەیشتە سێ ساڵان، هەردوو کۆمەڵە بەیەکەوە مەشق و ڕاهێنانیان پێکرا بۆ ماوەی چەند مانگێك بۆی دەرکەوت هەردوو کۆمەڵە لە یەك ئاستدان بۆ داخستنی قۆپچەی کراسیان[1]، کەواتە ئەو ڕاهێنانەی جاری یەکەم بە کۆمەڵەی یەکەم کرا سوودێکی ئەوتۆی نەبوو لەسەر داخستنی قۆپچە چونکە هێشتا منداڵەکان تەمەنیان دوو ساڵ بوو، بەڵام نەگەیشتبوونە ئاستی گەیین.

دەروونزان (جیزل) دەربارەی ڕۆڵ و کاریگەری گەیین لێکۆڵینەوەیەکی کرد لەسەر دوو کۆمەڵە منداڵی جمك کە لەڕووی تەندروستی تەمەنەوە ئاستیان وەکو یەك بوو، دابەشی کردن بەسەر دوو کۆمەڵە، کۆمەڵەی یەکەم تەمەنیان (٤٨) هەفتە بوو، ڕۆژانە بۆ ماوەی (١٠) خولەك مەشق و ڕاهێنانی پێ دەکردن بە سەرکەوتنی سەر پەیژە، ئەو ڕاهێنانە شەش هەفتەی خایاند، هەتا تەمەنیان گەیشتە (٥٢) هەفتە، توانایان هەبوو بەسەر پەیژەکە بکەون بە ماوەی بیست و شەش چرکە، بەڵام کۆمەڵەی دووەم کە هەلی مەشق و ڕاهێنانیان نەبوو تەمەنیان گەیشتبووە (٥٣) هەفتە هەمان پەیژەیان دەبڕی واتە بەسەر پەیژە دەکەوتن بە ماوەی (٤٥) چرکە، بەڵام پاش مەشق و ڕاهێنان بەهەمان شێوەی کۆمەڵەی یەکەم بە ماوەی دوو هەفتە توانایان هەبوو بەسەر پەیژەکە بکەون بە ماوەی (١٠) چرکە.

تێبینی دەکرێت کۆمەڵەی دووەم بەپێش کۆمەڵەی یەکەم کەوتن بە ماوەی ڕاهێنانی دوو هەفتە بەڵام تەمەنیان گەیشتبووە گەیین، کەواتە گەیین هۆکاری سەرەکییە بۆ ئاسانکردنی پرۆسەی فێربوون[2].

---

١- الاسس النفسية للنمو/ فؤاد البهي السيد.

٢- التعلم اسسه ومناهجه و نظرياته/ د. احمد زكي صالح.

(ماك چوش) دەربارەی چەمكی گەیین و پەیوەندی بەفێربوونەوە دەڵێت: (گەیین هەموو ئەو گۆڕانكارییانە لەخۆ دەگرێت كە مەرجن بۆ فێربوون لە ئاستی تەمەندا بێت، ئەو گۆڕانكارییانەش پشت بە هۆكارەكانی گەشەی ئەندامەكانی لەش دەبەستێت زیاترە نەك هۆكارەكانی ئەزموون و شارەزایی[1].

منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا جوولەكانی هەڵەشەییە (عشوائی) كاتێك كۆمەڵێك شەش پالو ئەخەینە بەردەستی پەرتوبلاوی دەكات، بەڵام كە تەمەنی گەیشتە دوو ساڵان توانای ئەوەی هەیە شەش پالوەكان لەسەر یەك دابنێت، لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنی توانای زیاتر دەبێت.

زیرەكیش رۆڵی خۆی دەبینێت لەسەر گەشەی جوولەیی (جیزل) دەڵێت: (منداڵ لە تەمەنی پێنج ساڵاندا توانای ئەوەی دەبێت لە ماوەی بیست چركەدا دوازدە دانەی مۆری بچووك بخاتە ناو شوشەیەكەوە، هەروەها لە كاتی وێنەكێشاندا و لە هەمان تەمەندا توانای هەیە هێلی راست بكێشێت بەهۆی گرتنی قەڵەمەكەی، بەڵام توانای كێشانی بازنەیەك یاخود چوارگۆشەیەكی نییە.

كەواتە ئەو لێكۆڵینەوانە دەسەلمێنن توانستەكانی جوولەیی بەدیار ناكەوێت تاكو ئەندامی دەمار بە تەواوی پێنەگات بۆیە هەموو هەوڵدان و راهێنانێك سەرف بكرێت لەگەڵ منداڵ پێش گەیین ئاكامی نابێت.

گرنگی گەشەی جوولەیی لای منداڵ هۆیەكە بۆ پەرەپێدان و پێشخستنی كەسایەتی منداڵ بەوپێیەی گەشەی جوولەیی لایەنێكی گرنگە كاریگەری پۆزەتیڤانەی دەبێت بۆ پتەوكردنی كەسایەتی بڕوا بەخۆبوون و پشت بەخۆبەستن، كاتێك منداڵ توانای ئەوەی دەبێت شت بەخۆی هەڵبگری بێ ئەوەی كەسێك یارمەتی بدات ئەوە مانای بڕوا بەخۆبوون لای ئەو منداڵە دروست دەكات و لە هەمان كاتیشدا رازی دەبێت لە خودی خۆی، ئەوەش دەبێتە رەخساندنی كەشوهەوایەكی دڵخۆشكەر بۆ ئەو منداڵە.

١- هەمان سەرچاوە.



## هۆكارەكانی گەشەكردنی جووڵەیی:

كۆمەڵێك هۆكار هەیە بەشدار دەبن لە پێشخستنی گەشەی جوولەیی منداڵ، كە بریتین لە هۆكاری بۆماوەیی و ژینگە و گەیین، هۆكاری ژینگە سەرەتا لە سكی دایكەوە دەست پێدەكات، بەڵام گەشەی جوولەیی لەو قۆناغەدا كەم هەستی پێ دەكرێت، بەڵام پاش ئەوەی لە دایكی جیا دەبێتەوە زیاتر ئەو هۆكارە رۆڵی خۆی دەبینێت، تەندروستی منداڵ و جۆری ئەو خواردنەی منداڵەكە دەیخوات یارمەتیدەرێكی چاكە بۆ گەشەی جوولەیی وەكو خێزانە دەوڵەمەندەكان كە جۆری خواردنیان باشە زووتر گەشە دەكەن، ئەگەرچی هەندێك لێكۆڵینەوەی دیكە ئەمە دەسەلمێنن منداڵ گەشەی جوولەیی زیاتر و باشترە لە خێزانە هەژارەكان ئەویش بەهۆی ئەوەی كە منداڵ كاتێكی زۆر بەتەنها بەجێ دەهێڵدرێت زووتر گەشە دەكات، وەكو شارستانی و رۆشنبیری منداڵانی ئوغەندا زوو گەشە دەكەن، چونكە زۆربەی كات لەسەر پشتی دایكیان لە كاتی ئیشكردنیاندان پاشان بە تەنها بەجێیان دەهێڵن، بۆیە ئەو منداڵانەی لەڕووی گەشەی جوولەییەوە لە پێشترن لە منداڵانی دیكە، دوای ریزبەندی منداڵ، منداڵی یەكەم لە خێزاندا زووتر گەشەی جوولەیی دەست پێدەكات لەبەر ئەوەی دایك و باوك زۆر راهێنانی لەگەڵدا ئەنجام دەدەن، بەڵام لەگەڵ منداڵی دووەم و سێیەم... هتد ئەو راهێنانە ئەنجام نادەن.

بێبەشبوون لە هەستی جوولەیی گەشەی منداڵ دوا دەخات، بەڵام بەپێچەوانەوە منداڵ كاتێك گرنگی بەلایەنی هەستی جوولەیی درا پێش دەكەوێت لەڕووی جوولەییەوە.

هەردوو زانا (سالی و بروتس) كە پسپۆر بوون لە نەخۆشی منداڵان، لە ناوەڕاستی شەستەكاندا لێكۆڵینەوەیەكیان لەو بابەتە ئەنجام دا، كە بەراوردیان لەنێوان دوو كۆمەڵە منداڵ كرد كە ژمارەی هەر كۆمەڵەیەكیان (٧٥) منداڵ بوو، كۆمەڵەی یەكەم لە دایەنگا پەروەردە دەكران كە مەرجەكانی تەندروستی تێدابوو وەكو پاكوخاوێنی و رووناكی و سارد و گەرمی... هتد، بەڵام تەنها یەك كەس سەرپەرشتی دەكردن ئەویش بۆ ماوەی رۆژانە (٨) كاتژمێر، بەڵام كاتەكانی دیكە كە (١٦) كاتژمێر بوو هیچ

کەسیان لا نەبوو تەنها لە کاتی خواردن پێدان نەبێت ئەگەر پێویستییەکیان هەبوایە وەکو جل گۆڕین و کەلوپەل خاوێنکردنەوە، ئەو منداڵانە بەدیارکەوت کە کەسایەتی ئاسایی نین و زەردەخەنە لەسەر لێویان نییە و کەس قسەیان لەگەڵ ناکات، بەدیارکەوت ئەو کۆمەڵە منداڵە جیاوازی زۆریان هەیە لەگەڵ منداڵەکانی کۆمەڵەی دووەم کە لە ماڵەوە پەروەردە دەکران ئەوە هەتا تەمەنی چوار مانگی لە پاشان کە تەمەنیان گەیشتە (١٠) مانگی زیاتر ئەو جیاوازییە هەست پێ دەکرا، منداڵی دایەنگاکە وەکو بووکێکی لە دار دروستکراو وابوون، بەڵام منداڵەکانی ناو خێزان بەتواناتر بوون و جوولەیان زیاتر بوو.

هەروەها لێکۆڵینەوەی دیکە بەدیاری خستووە ئەو منداڵانەی لە شوێنی دیکەی دەرەوەی خێزان پەروەردە دەکرێن لە ماوەی تەمەنی یەك ساڵیان بە ئاشکرا دواکەوتنی جوولەیان پێوە دیارە هەروەها لە گەشەی زمانی و گەشەی عەقلیش[1].

## گەشەی عەقڵی (معرفي)

منداڵ کاتێك لە دایك دەبێت هەموو ئەندامەکانی لەشی لە ئامادەباشی دایە بۆ ژیان بۆ ئەوەی خۆی لەگەڵ ژینگەدا بگونجێنێت، جا بۆ خۆ گونجاندن تاك دەبێت دەرك بەو شتانەی دەوروپشتی خۆی بکات.

منداڵ لە ڕێگای هەستەکانی خۆیەوە دەرك بە شتەکانی دەوروپشتی خۆی دەکات کە دەرك پێکردنیش یەکێکە لە پرۆسەکانی گەشەی عەقڵی منداڵ، بۆ گەشەکردنی عەقڵی منداڵ پێویستە هەموو هەستەکانی سەلامەت بن و دوور لە هەموو خەوشێك هەروەها کۆئەندامی دەماری ناوەندی بەهەمان شێوە پێویستە بێ خەوش بێت، چونکە لەو ڕێگەیەوە منداڵ لە سەرەتادا دەتوانێت وێنەکردنی هەستەکان لە هزر و بیری خۆی بکێشێت پاشان بەشێوەیەکی دروست دەریان ببڕێت، کەواتە بەوپێیە دەتوانین بڵێین

١- مدخل علم النفس/ لندا. ل. دافيدوف، ترجمة د. سيد الطواب و د. محمود عمر.



گەشەی عەقڵی منداڵ لە ڕێگای هەستەکان و کۆئەندامی دەماری ناوەندییەوەیە جگە لە ئاوێتەبوونی منداڵ لەگەڵ ئەو ژینگەی تێدا دەژی.

ناکرێت باس لە گەشەی عەقڵی بکرێت باس لە زانای سویسری (جان پیاجە) نەکەین کە بەدرێژایی ٥٠ ساڵ خەریکی لێکۆڵینەوە بوو لەسەر گەشەی عەقڵی منداڵ (جان پیاجە) بڕوایەکی تەواوی بە ژینگە هەبوو بۆ سەر گەشەی عەقڵی منداڵ، جا بۆ ئەوەی بمانەوێت پەرە و گەشە بە عەقڵی منداڵ بدەین، دەبێت ژینگەیەکی گونجاو بۆ ئەو منداڵە بڕەخسێنین، واتە منداڵ لە چ نەتەوەیەك پەروەردە بکرێت خاسیەت و تایبەتمەندی ئەو نەتەوەیە هەڵدەگرێت، (جان پیاجە) لای وایە هیچ جیاوازییەك لەنێوان نەتەوەکاندا نییە دەربارەی گەشەی عەقڵی و ڕێژەی زیرەکی، ئەویش لە ڕێگای ئەو لێکۆڵینەوەیەی لە ساڵی ١٩٥٩ لەسەر کۆمەڵێك منداڵی نەتەوە جیاواز ئەنجامی دا لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت هیچ جیاوازییەك نییە لەنێوان گەشەی عەقڵییان، تەنها جیاوازییەکی کەم نەبێت، ئەو جیاوازییە کەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ژینگە باشەی کە هەیە لەنێوان نەتەوەکاندا.

دەروونزان (جان پیاجە) لای وایە گەشەی مەعرفی لەلای منداڵ بەرهەمی هەموو ئەو شتانەیە کە کردارەکانی دەگۆڕێت بۆ وێنەیەکی هزری کە پێی دەگوترێت بیرکردنەوە، هەروەها ئەو تیورییە بریتییە لە ئاوێتەبوونی منداڵ لەگەڵ ژینگەکەی چونکە منداڵ بوونەوەرێکی زیندووە ئەو ئاوێتەبوونەش شتێکی پێویستە بۆ ڕەفتاری زیرەکی، چونکە لای پیاجە خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ ژینگە مانای زیرەکییە، پاشان دەڵێت هەموو ڕەفتارێکی مەعرفی کە منداڵ پێوەی هەڵدەستێت یارمەتیدەرە بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ ژینگە، ئەو ڕەفتارەش شێوەیەکە لە شێوەکانی ڕێکخستنی ناوخۆ، بە نەمان و نەبوونی ئەو ڕێکخستنە گەشەی مەعرفی دەبێتە شتێکی مەحاڵ، لە تایبەتمەندییەکانی پرۆسەی ڕێکخستن هەوڵدانە بۆ وەدەستهێنانی هاوسەنگییەك کە هەموو تاکێك هەوڵ دەدات بۆ بەدەستهێنانی ئەویش لە ڕێگای هەردوو پرۆسەی:

**نواندن:** بریتییە لە جێبەجێکردنی شێوازێکی دیاریکراو لە رەفتار لە هەڵوێستێکی نوێدا یاخود رووداوێکی نوێ واتە هەوڵدانی منداڵ بۆ ئەوەی بتوانێت راستییەکان بگونجێنێت لەگەڵ ئاراستە و بیروبۆچوونی خۆی.

**خۆگونجاندن:** واتە دووبارە رێکخستنەوەی بونیادی مەعرفی تاك، یاخود پێکهاتووە لە کرداری بەیەك گەیاندنی نواندن وە هەموو گۆڕانەکانی چەمك و ستراتیجییەك دەگرێتەوە کە تاك پێی دەگات.

جان پیاجە گەشەکردنی مەعرفی دابەش کردووە بۆ چوار قۆناغ:

**١- قۆناغی هەستی جوولەیی:** ئەو قۆناغە دەست پێدەکات لە رۆژی لەدایکبوونەوە تاکو تەمەنی دوو ساڵی، منداڵ لەو قۆناغەدا دەرك بە جیهانی دەوروپشتی خۆی دەکات ئەویش بەهۆی هەستەکانیەوە (چاو، گوێ، بۆن، دەست لێدان، چێژ وەرگرتن) یاخود بەمانایەکی دیکە منداڵ پشت بەهەستی جوولەیی دەبەستێت، لەو کاتەشدا هەندێك لە توانستەکانی بنچینەیی مەعرفی گەشە دەکات، هەروەها منداڵ توانای دەبێت لەسەر جوولەی جەستەیی، منداڵ لەو تەمەنەدا توانای باشی لێکدانەوەی شتەکانی نییە تەنها دەرك بەوە دەکات کە لەبەر چاویەتی.

**٢- قۆناغی دووەم بریتییە لە قۆناغی پێش کرداری:** ئەو قۆناغە لە تەمەنی دوو ساڵییەوە دەست پێدەکات تاکو تەمەنی حەوت ساڵی، منداڵ لەو تەمەنەدا بە پلەی یەك پشت بە دەرك پێکردنی واقیع دەکات بەشێوەیەکی گشتیش چارەسەری گرفتەکان دەکات بە شتە هەست پێکراوەکان، بەڵام لە شتە رووتەکان بەزەحمەت بەرەورووی هەمان گرفتەکان دەبێتەوە، بۆ نموونە منداڵ لەو قۆناغە بە ئاسانی دەتوانێت سندووقێکی گەورە جیا بکاتەوە لەناو کۆمەڵە سندووقێکی دیکەدا، لە شتە رووتەکانیشدا دەڵێین (أ) گەورەترە لە (ب)، (ب) گەورەترە لە (ج) ئایا کامیان لە هەموویان گەورەترە.

هەروەها کۆمەڵێك وێنەی لێك جیاواز وەکو کۆمەڵێك چوارگۆشە و سێگۆشە و بازنە، منداڵ لەو قۆناغە توانای لە یەکتر جیاکردنەوەی وێنەکانی هەیە لە یەکتری، هەرچی



وێنەی چوارگۆشە هەیە لەسەر یەك کۆیان دەکاتەوە، بازنەکان و سێکۆشەکانیش بەهەمان شێوە، هەروەها جیاکردنەوەی رەنگەکان لە یەکتری.

لە لێکۆڵینەوەیەکی دەروونزان (سمیث) بەدیار کەوتووە منداڵ لە سەرەتای تەمەنی دوو ساڵیدا تاکو تەمەنی شەش ساڵاندا بەزەحمەت دەتوانێت دەستە راست و چەپ و باکوور و باشوور جیا بکاتەوە، بەڵام لە تەمەنی ٦ ساڵی و زیاتر ئەو توانایە پەیدا دەکات بۆ ئەوەی چوار دەوری خۆی بناسێت، هەروەها لە لێکۆڵینەوەیەکی دیکەی دەروونزان (رایس)دا بەدیاری خست منداڵ لەنێوان تەمەنی ٣ ساڵی و نۆ ساڵیدا توانای هەیە پارچە ئاسن یاخود دار لە شوێنی دیاریکراوی خۆی دابنێت، واتە پارچە تەختەیەك دابنێن بۆشاییەك بەجێ بهێڵێن لەسەر شێوەی بازنە بۆ نموونە دەتوانیت پارچە بازنەکە هەڵبگریت لەسەر تەختەکە دابنێت[1].

**قۆناغی کرداری هەستکردن:** ئەو قۆناغە لە تەمەنی حەوت ساڵی دەست پێدەکات تاکو تەمەنی یازدە ساڵی، منداڵ لەو تەمەنەدا توانای ئەوەی دەبێت کە عەقڵ و مەنتیق بەکاربهێنێت و بەشێوەیەکی گشتیش پشت بە زانستەکانی هەستی دەبەستێت بۆ تێگەیشتن لە شت هەر لەو قۆناغەدا توانای بەدەستهێنانی هۆش و بیری دەبێت بۆ کردارەکان، بۆ نموونە دوو شووشە دەهێنین یەکێکیان باریك و درێژ ئەوی دیکە کورت و تیرە گەورە، رێژەیەکی دیاریکراو لە ئاو لەناو شووشە گەورەکە دەکەین، پاشان هەمان رێژە لە ئاوەکە لەناو شووشە باریکەکە دەکەین، منداڵ لەو تەمەنەدا سەیر دەکات ئاوەکە لە شووشە باریکەکە بەرزە کەچی لە شووشە تیرە فراوانەکە بەرزی کەمە بە بەکارهێنانی عەقڵ و بیری خۆی دەزانێت رێژەی ئاوەکە هەمان رێژەیە و گۆڕانی بەسەردا نەهاتووە، بەڵام لەبەر باریکی وا بەرز بۆتەوە[2].

---

١- فؤاد ابهي السيد/ الاسس النفسية للنمو.

٢- مدخل علم النفس/ لندا دافيدون/ ترجمة محمود سيد الطواب.

**قۆناغی کرداری عەقڵی رووت:** ئەو قۆناغە لە تەمەنی یازدە ساڵی تاکە دەگاتە قۆناغی هەرزەکاری دەگرێتەوە، منداڵ لەو تەمەنەدا کرداری هەستی ئاڵۆزتر بەکار دەهێنێت لە قۆناغی پێشووتر بەشێوەیەکی زیاتر مەنتقیانەتر بیر دەکاتەوە، چونکە لە قۆناغی هەرزەکاری نزیك دەبێتەوە، منداڵ دەتوانێت بەدوای ئەلتەرناتیڤدا بگەڕێت بۆ چارەسەرکردنی کێشە و گرفتەکانیدا.

## بیرکردنەوە

بیرکردنەوە بریتییە لە هەموو چالاکییەکانی عەقڵی و بەکارهێنانی هێما لەجیاتی شت و کەس و هەڵوێست نواندندا، لەو کاتەی هەڵسوکەوت دەکات بەهەڵوێستی واقیعیانە.
وە ئەو هێمایانەی عەقڵ بەکاریان دەهێنێت هەمەچەشن و جیاوازە، هەندێکیان لەسەر شێوەی وێنەی هزرییە یاخود دەربڕینە یاخود ژمارەیە.
کەواتە بیرکردنەوە یەکێکە لە گرنگترین کردارەکانی عەقڵی و بەرزترین پلەیە لای بوونەوەرەکان ئەو کاتەی دەرك بە پەیوەندییەکان دەکات، ئەو بیرکردنەوەیەش بە پلەی یەکەم لای مرۆڤ و ئاژەڵە عاقڵەکان، بەڵام ئاژەڵی کەم عەقڵ ئەو پرۆسەیە نایانگرێتەوە بەهۆی نەبوونی یان کەمی فسیۆلۆژی لە عەقڵ، مرۆڤ بەهۆی عەقڵ و شارەزایی رابردووی خۆی دەتوانێت گەلێك لە کێشە و گرفتەکانی خۆی چارەسەر بکات، بۆ نموونە مرۆڤ سەرەتا بەهۆی خوێندن و لەبەرکردنی خشتەی لێکدان دەتوانێت بەبێ ئەوەی شتێك یاخود پەنجەکانی دەستی بەکار بهێنێت دەزانێت (٩ × ٩ = ٨١) یاخود بە مانایەکی دیکە بڵێین پرۆسەی بیرکردنەوە ناکرێت ئەگەر بێتو نەگەڕێینەوە بۆ دواوە کە لێوەی فێربووینە.

## سوودەکانی بیرکردنەوە:

بیرکردنەوە هۆیەکە بۆ مرۆڤ تاکو بتوانێت سوود لە شارەزایی رابردووی خۆی وەربگرێت، و لەکاتی پێویستدا سوود لەو شارەزاییە وەربگرێت، هەروەها ئامێرێکە



بەدەست مرۆڤەوە بۆ ئەوەی هەڵسوکەوت لەگەڵ داهاتوو بکات، هەروەها دەتوانێت لە رێگای بیرکردنەوە ئامانج و رەفتارەکانی خۆی دەستنیشان بکات و لە بەرژەوەندی خۆی بەکاری بهێنێت، دیسان لە رێگای بیرکردنەوە دەتوانێت سوود لە شارەزایی دەوروپشتی خۆی وەربگرێت، کە ئەوەش دەبێتە پاڵپشت بۆ سوود وەرگرتن لە کات، دوورکەوتنەوە لە شتی مەترسیدار و چارەسەرکردنی کێشەکان بەکاتێکی کەم[1].
وەکو لە پێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد بیرکردنەوە پشت دەبەستێت بە گەڕانەوە بۆ شارەزایی رابردوو کە فێری بووینە، بەڵام گەڕانەوە بۆ سەردەمی رابردوو پێویستی بە گەلێك رێگای جیاوازەوە هەیە:
١- وێنەی عەقڵی هەستی مرۆڤ بەهۆی هەستەکانییەوە توانای هەیە کە سوود لە شارەزایی خۆی وەربگرێت بە پلەی یەکەمیش هەستی چاو، گوێ. بۆ نموونە هەر کاتێك تۆ بەرامبەر کەسێك رادەوستی پاش ئەوەی ئەو کەسە لەبەر چاوت ون دەبێت وێنەی ئەو کەسە دێتەوە بەرچاوت ئەو شێوەیە کە لە وێنەی عەقڵی هەستی چاو، دیسان بەهۆی وێنەی عەقڵی هەستی گوێ (بیستن) توانای هەیە دەربڕینەکانی بهێنێتەوە بەرگوێی قسەکانی لە گوێ بزرینگێتەوە.
٢- وێنەی عەقڵی دەربڕین هەر کاتێك منداڵ گوێی لە دەنگی دایکی دەبێت کە بانگی دەکات ئەو وشە و دەربڕینانەی دایکی دەرك پێکردنی هەستییە، بەڵام بەشێوەی وێنەیەکی عەقڵی دەربڕینە وە ئەگەر بنووسرێتەوە دەبێتە وێنەی عەقڵی هەستی جوولەیی[2].

## هەنگاوەکانی بیرکردنەوە و چارەسەری گرفتەکان:

دەروونزان جون دیوی لەو باوەڕە دایە هەر کاتێك تاك بەرەوڕووی گرفتێك دەبێتەوە عەقڵی خۆی دەخاتە گەڕ بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو گرفتە:

١- علم النفس الطفولة والمراهقة/ حسين الألوسي، واميمه علي خان.
٢- علم النفس الطفولة والمراهقة/ حسين الآلوسي، اميمه علي خان.

**هەستکردن بە گیروگرفت:** هەر کاتێك مرۆڤ بەرەورووی گرفتێك بۆوە، تووشی دڵەڕاوکێ دەبێت، بیر لەوە دەکاتەوە کە چۆن بەسەر ئەو گرفتە زاڵ بێت و کۆتایی بەو کێشە و گرفتە بهێنێت، ئەو هەستکردن بە گرفتە پاڵنەرێکی بەهێزە بۆ کردنەوەی گرێ کوێرەکان.

**دەستنیشانکردنی گیروگرفت:** هەر کاتێك مرۆڤ تووشی ئەو کێشە و گرفتە بوو هەوڵ دەدات بزانێت گرفتەکە لەکوێوە سەری هەڵداوە بۆ ئەوەی باش لێی تێبگات، جا دەستنیشانکردنی ئەو گیروگرفتە هۆیەکە بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکە، یاخود بە مانایەکی دیکە بڵێین دەستنیشانکردنی گرفتەکە هەنگاوی یەکەمە بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتەکە.

**دانانی گریمانە:** هەر کاتێك گرفتەکە هاتە پێشەوە، مرۆڤ عەقڵی دەخاتە ئیشکردنەوە و هەوڵ دەدات سەرجەم زانیارییەکان کۆبکاتەوە، لەسەر ئەو گرفتە چەند گریمانەیەك دادەنێت بۆ ئەوەی بزانێت گرفتەکە لە کامیاندایە، بۆ نموونە ڕێژەی دەرچوونی قوتابییان لە ساڵێك لە ساڵەکانی خوێندندا کەمە، ئەو خۆی لەخۆیدا گرفتە، بەڵام نازانین گرفتەکە لە کوێیە؟ چەند گریمانەیەك دادەنێین و دەڵێین ڕەنگە هۆکاری کەمی ڕێژەی دەرچوون لە خراپی پرۆگرامەکانی خوێندنە چونکە پرۆگرامەکان کۆنن و سەردەمیان بەسەرچووە، یاخود نەبوون و کەمی مامۆستا ئەوە بۆتە کەمی ڕێژەی دەرچوون، یاخود زۆری ژمارەی قوتابییان لە پۆلدا، یاخود کەمی دەوامی قوتابییان لە ساڵی خوێندن.

**تاقیکردنەوەی گریمانەکان:** ئەوانە هەموویان پەیوەندییان بەڕێژەی دەرچوونەوە هەیە، بۆیە لە گریمانەی یەکەم کە خراپی پرۆگرامەوە دەست پێ دەکەین بە گۆڕینی پرۆگرامی خوێندن پاشان تەماشای ڕێژەی دەرچوون دەکەینەوە ئەگەر هاتوو ڕێژەی دەرچوون باش بوو گەیشتە ئەو خواستەی ئێمە دەمانەوێت، کەواتە توانیومانە چارەسەری کێشەکە بکەین، وە ئەگەر هاتوو ڕێژەی دەرچوون هەروەکو خۆی بوو ئەوجارە دێینە سەر گریمانەی دووەم کە کەمی یاخود نەبوونی مامۆستایە بۆیە هەڵدەستێین مامۆستا دابین دەکەین بۆ قوتابییان، پاشان تەماشای ئەنجامی دەرچوون دەکەین، ئەگەر ڕێژەکە زیادی کرد ئەوە توانیومانە ئەو کێشەیەش



چارەسەر بکەین، وە ئەگەر ڕێژەکە دیسان بەدڵمان نەبوو دەچینە گریمانەی سێیەم، کە کەمکردنەوەی ژمارەی قوتابییانە، ئیتر بەو شێوەیە گریمانەکان دادەنێین و یەکە یەکە دەستنیشانیان دەکەین و چارەسەریان بۆ دەدۆزینەوە.

**چارەسەری کێشەکان:** لە خاڵی چوارەمدا دەستنیشانی گریمانەکان کرا، کە گریمانەکانمان یەکە یەکە تاقیکرانەوە، هەر کەموکوڕییەك لە گریمانەکان هەبێت چارەسەری دەکەین.

## زیرەکی

ئەگەر بە وردی سەرنجی دەوروپشتی خۆمان بدەین، هیچ شتێك نییە لە سەدا سەد بەیەکچن، هەتا لە مرۆڤیشدا گەلێکجار دەبینین دوو منداڵی جمك لەگەڵێك ئاکار و سیفاتدا شێوەیان لەیەك دەچێت، بەڵام هەرگیز ئەمە مانای ئەوە نییە هەردووکیان بەیەك دەچن، چونکە هەندێك تایبەتمەندی هەیە لە یەکێکیان لەویتر بەرچاو ناکەوێت، یاخود لە شێوە و رووخساردا لە یەکتر جیاوازن یاخود هەڵسوکەوت لە یەکیان جیا دەکاتەوە.

زیرەکیش یەکێکە لە کردارەکانی عەقڵی، کەواتە جیاوازی لە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر هەیە ڕەنگە پرسیار بکرێت هۆی ئەو جیاوازییە چییە و لەکوێوە سەرهەڵدەدات؟ ئایا کۆمەڵگایەك هەیە لە کۆمەڵگایەکی تر زیرەکتر بن، ئایا شتێکی خۆرسکە یاخود مرۆڤ دەتوانێت بەدەستی بهێنێت؟

تاکو ئێستا هیچ لێکۆڵینەوەیەك ئەوەی نەسەلماندووە کە میللەتێك لە میللەتێکی تر زیرەکتر بێت بەڵام زیرەکی لەنێوان تاکێك و تاکێکی تر هەیە ئەویش بەهۆی ئەو بەهرەییەی کە لە زەگماکەوە لەگەڵیدا لە دایك دەبێت.

وشەی زیرەکی بۆ یەکەمجار لە لایەن فەیلەسووف (شیشرون) بەکارهات، کە وشەکە لە زمانی لاتینی (Inteliigentia) پاشان ئەو وشەیە لە هەردوو زمانی ئینگلیزی و فەڕەنسی بە (Inteliigence) بڵاوبۆوە، ئەم وشەیە لە زمانەوانیدا واتای هزر دەگەیەنێت و (Inteliect) لە تێگەیشتنیدا (understanding).

فەلاسفەکانی یۆنانی کۆن گرنگییان دەدا بە چالاکی عەقڵی، بۆ نموونە ئەفلاتوون دەروونی مرۆڤی دابەش کردبوو بۆ سێ لایەن (عەقڵ، ئارەزوو، تووڕەبوون) ئەرەستۆش دابەشی کردبوو بۆ دوو هێز یەکەمیان عەقڵی و زانستی دووەمیان دروستبوونی هەڵچوون، کەواتە یۆنانییە کۆنەکان جەختیان لەسەر لایەنی دەرك پێکردنی چالاکی عەقڵی تاك دەکرد.

بەڵام دەروونزان (هربرت سینسر) لایەنی عەقڵی جیا کردەوە بۆ دوو لایەن کە بریتی بوو لە لایەنی زانیاری و لایەنی ویژدانی، کار و چالاکی لایەنی زانیاری بریتییە لە یارمەتیدانی بوونەوەری ئەندامی بۆ خۆگونجاندن بۆ ئەکتیفکردنی لەگەڵ ژینگەدا، (سپنسر) وا پێناسەی ژیان دەکات کە بریتییە لە خۆگونجاندنی بەردەوام لە پەیوەندییەکانی ناوخۆ و دەرەوەدا، ئێمەش دەتوانین ئەو خۆگونجاندنەمان لە زیرەکییەوە بێت.

هەروەها دەروونزان جان پیاجە کە گرنگی زۆری بە لایەنی زانیاری منداڵ دەدات دەڵێت (زیرەکی بریتییە لە خۆگونجاندنی مرۆڤ لەگەڵ ئەو ژینگەیەی تێدا دەژی).

لەلای نورندایك (زیرەکی شتێکی بۆماوەییە نەك بەدەستهێنان) چونکە ئەو دەروونزانە تەفسیری زیرەکی دەکات لەڕووی بایلۆژییەوە کە کردارەکانی عەقڵی لە ئەنجامی کاری کۆئەندامەکانی دەمارەوەیە.

لەلای هەندێکی تر زیرەکی بریتییە لە سەرکەوتنی تاك لە ژیانی کۆمەڵایەتی، کە دابەشیان کردووە بۆ سێ لایەنی سەرەکی زیرەکی کرداری کە توانستەکانی کردار دەگرێتەوە، هەروەها زیرەکی رووت لە توانایە لەسەر هەستکردن بە پەیوەندییەکان و تێگەیشتن لەسەر بەکارهێنانی هێما، پاشان زیرەکی کۆمەڵایەتی ئەوەش توانایە لەسەر تێگەیشتنی بەرامبەر و ئاوێتەبوون لەگەڵیاندا.

بەڵام زیرەکی لەلای دەروونزان (سپیرمان) توانایە لەسەر پەیوەندییەکان و ئەوانەی پێیان بەستراوەتەوە و لای (تیرمان)یش زیرەکی بریتییە لە توانای تاك بۆ بیرکردنەوەی رووت و بەس.



زیرەك بەو کەسە دەڵێن کە خاوەن بەهرەیەکی تایبەتن، یاخود ئەو کەسانەی توانایان لە کەسانی هاوتەمەنی خۆیان زیاترە، کەواتە بەهرە پەیوەندییەکی بەهێز و پتەوی هەیە لەگەڵ زیرەکی، بەو مانایەی ئەو کەسانەی کە رێژەی زیرەکییان زۆرە بەکەسی بەهرەدار دەناسرێن.

دەروونزانەکان رادەی زیرەکی لەنێوان (١٣٠ — ١٨٠) دادەنێن، بەگوێرەی پێوەری (ستانفورد- بینیە) هەروەها رێژەی ئەو منداڵانەی زیرەکن لە جیهاندا ٢,٠٪ دەخەملێنرێت، بێ ئەوەی جیاوازی هەبێت لەنێوان نەتەوەیەك و نەتەوەیەکی تر لە رووی زانستی بۆماوە تەنها ئەوەندە هەیە هەندێك لە دەوڵەتانی پێشکەتوو، ژینگەیەکی چاك ئامادە دەکەن بۆ ئەو جۆرە تا بتوانێت لە دوارۆژدا بەهرەی خۆیان پەرەپێ بدەن و راهێنان بجووڵقێنن.

منداڵی بەهرەدار گەر بێتو بەراوردیان بکەین لەگەڵ منداڵانی ئاسایی سەیر دەکەین لە هەموو بوارێکدا لە منداڵانی ئاسایی وەکو لایەنی تەندروستی، جەستەیی، تەندروستی، دەروونی، کۆمەڵایەتی، ئابووری.

دەروونزانی ئەمریکی (ترمان) لە ساڵی ١٩٢١ هەستا بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر (١٥٠٠) منداڵ لە ویلایەتی کالیفۆرنیا گەیشتە ئەو راستییەی کە ئەو منداڵانەی زیرەکن لەڕووی تەندروستییەوە زۆرباشن، هەروەها لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە کراوەن، دەتوانن لەگەڵ دەوروبەرەکەیان بەزووترین کات خۆیان بگونجێنن، دیسان لەڕووی ئابووریشەوە ئاستی بژێوی ژیانیان باشە، چونکە ژینگە زەمینە خۆشکەرە بۆ پەرەپێدانی منداڵ، بەدڵنیاییەوە دەڵێم کوردستانی ئێمە بە دەیەها منداڵی خاوەن بەهرە و زیرەکی تێدا هەڵکەوتووە، بەڵام ژینگەی باشی بۆ نەڕەخساوە بۆیە دەبینین بەهرە و زیرەکییەکەیان لە شوێنی خۆیدا پووکاوەتەوە، یاخود ئەدیسۆن و بتهۆڤن گەر خەڵکی وڵاتێکی دواکەوتوو بوونایە ئایا دەیانتوانی ئەو داهێنانە دابهێنن؟

منداڵی زیرەك هەر لە سەرەتای منداڵییەوە هەست بە زیرەکییان دەکرێت، لە ماوەی کەمی ژیاندا دەتوانێت بەهرە و توانای خۆی بسەلمێنێت نموونەی ئەو راستییەش لە مێژوودا زۆرە.

زانای بیرکاری (گاوس) کاتێك قوتابی دەبێت لە قۆنـاغی سـەرەتایی، مامۆسـتاکەیان پرسیارێك لە قوتابییەکان دەکات و دەڵێت: (کامتان بەزووترین کات لە ژمـارە (١ — ١٠) کۆ دەکاتەوە و ئەنجامەکەی دەکاتە چەند؟
گشت قوتابییەکان هەستان بە کۆکردنەوەی ژمارەکان بەشێوەیەکی کلاسیکی وەکو (١ + ٢ = ٣) (٣ + ٣ = ٦) (٦ + ٤ = ١٠) (١٠ + ٥ = ١٥) (١٥ + ٦ = ٢١) (٢١ + ٧ = ٢٨) (٢٨ + ٨ = ٣٦) (٣٦ + ٩ = ٤٥) (٤٥ + ١٠ = ٥٥) ئـــــەو ئەنجامەکەیەتی، بەڵام (گـاوس)ی زانـا یەکـسەر گـوتی ئەنجامەکـەی دەکاتـە (٥٥)، مامۆستا لە وەڵامەکەی سەری سوورِما و گوتی چـونت زانـی؟ لـە وەڵامـدا (گـاوس) گوتی پێویست ناکات ئەو هەموو کردارە بکەین بەڵکو دەڵێین (١ + ١٠ = ١١) (٢ + ٩ = ١١) (٣ + ٨ = ١١) (٤ + ٧ = ١١) (٥ + ٦ = ١١) کەواتـە (٥) کردارمـان کرد و پاشان ٥ × ١١ = ٥٥ ئەنجامی دیسان بە ئاسانی دەردەچێت.
بۆیە هەر زوو بیر لە گاوس کرایەوە و خرایە پـەروەردەی تایبـەت بـۆ ئـەوەی گرنگـی پێبدرێت، هەتا لە پاشەڕۆژدا ببێتە تاکێکی سوودبەخش بۆ خـۆی و مرۆڤایـەتی، لـە راستیشدا هەروابوو، گاوس بووە زانایەکی بەرز لە بواری بیرکاریدا.
پەروەردەی تایبەت: بریتییـە لـە کۆمـەڵێك کـارگوزاری رێکـوپێکی ئامانجـدار، کـە پێشکەشی ئەو منداڵانە دەکرێت کە جیاوازییان هەیە لەگەڵ منداڵانی ئاسایی، جا ئەو جیاوازییە بەرزتر بێت لە منداڵانی ئاسایی یاخود نزمتر بێت.
مەبەست لە وشەی بەرزتر یاخود نزمتر، ئەوەیە کە هەوڵ بـدەین بـارودۆخێکی گونجـاو بۆیان دابین بکەین بەگوێرەی ئاستی ژیرییان، بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی چاك گەشە بکـەن و بەخودی خۆیان ئامانجی خۆیان بەدەست بهێنن.
بەشـێوەیەکی گـشتی ئامـانجی پـەروەردەی تایبـەت هـیچ جیاوازییـەکی نییـە لەگـەڵ پەروەردەی گشتی، تەنها ئەوەندە نەبێت کـە پێـشکەشکردنی جـۆری ئـەو کارگوزارییـە هەرکەسە بەگوێرەی توانای خۆی و هەروەها جۆری پێشکەشکردن و ئـەو کەسـانەی ئـەو کارە ئەنجام دەدەن، پەروەردە بە هەموو شێوەکانیەوە رێگە بە هەموو کەسێك دەدات کـە



سوود لە پرۆسەی پەروەردە وەربگرن، بۆ ئەوەی ببێتـە یارمەتیـدەرێك بـۆ گەشـەکردنی، بەڵام وەکو روون و ئاشکرایە لای هەموو کەسێك ئەو منداڵانەی کە پەروەردە باوەشی بـۆ کردونەتەوە پلەی ئاستی ژیری و هەڵچوونی باری کۆمەڵایـەتییان لـە یـەکتری جیـاوازە، هەیانە رێژەی زیرەکییان گەلێك بەرزە و هەشیانە بەپێـچەوانەوە پلـەی ئاسـتی ژیرییـان نزمە، دیارە ئەمەش شتێکی مەحاڵە کە یەك جۆرە پەروەردە هەموو چینێك بگرێتـەوە، بۆیە دەبێت هەریەکێکیان لەمانە پەیڕەو و پرۆگرامی تایبەتیان بـۆ دابنرێـت کـە لەگـەڵ ئاستی ژیـری زیرەکییـان گونجـاو بێـت، بـۆ نموونـە ئـەو منداڵانـەی کـە زۆر زیـرەك و پێشکەوتوون دەبێت هەوڵ بدرێت سوود لە وزەیان وەربگیرێت و بـە چـاکترین و باشـترین شێوەش چاودێری تەواو بکرێن بۆ ئەوەی ئەو بەهرەی هەیانە نەپوکێتەوە، هـەروەها ئـەو کەسانەی کەم ژیرن نابێت فەرامۆش بکرێن و گرنگییان پێ نەدرێت بۆ ئەوەی لە دوارۆژدا نەبنە بارگرانی بەسەر خێزان و کۆمەڵدا و لەسەر شەقام و بازاڕ بـسووڕێنەوە بـەبێ کـار، چونکە ئەو جۆرە کەسانە دەبنە جێگـای گاڵتـەپێکردنی کۆمـەڵ، چـونکە دەبێـت هـەر یەکێك لە ئێمە بڕوامان وابێت کە دەتوانین سوود لـە وزەی هـەموو کەسـێك وەربگـرین، بەڵام هەر کەسێك بەقەدەر توانای ژیری جەستەی نابێت کەموکوڕی لەشی و کەم عـەقڵی وامان لێ بکات ئەو کەسانە بێبەش بکەین لەو مافەی کە هەیەتی.
کێن ئەوانەی پەروەردەی تایبەت ئاماژەمان پێکرد پەروەردەی تایبەت ئەو منداڵانە دەگرێتەوە کە جیاوازییان هەیـە لەگـەڵ منـداڵانی ئاسـایی، کەواتـە لـە منـداڵانی نائاسایی جۆرە لادانێکی ئاشکرا هەیە، جا ئەو لادانە لەڕووی ژیرییەوە بێت یـاخود هەڵچوون یان کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەوەی گرنگە لای ئێمە چۆن بتوانین دەستنیـشانی ئەو جۆرە کەسانە بکەین کە دەکەونە ناو خانـەی پـەروەردەی تایبەتـەوە، هـەروەها رێژەی ئەو منداڵانە چەندە لەناو کۆمەڵدا و ئایا چ فاکتەرێك وای کردووە پەروەردەی تایبەت بیانگرێتەوە؟
راستییەکی زانستی هەیە کە پسپۆران و دەروونزانەکان لە سەری رێککەوتوون، ئەویش تاقیکردنەوەی زیرەکییە کە بەسەر چەند کەسانێك تاقیکرایەوە بۆ ئـەوەی بـزانن بـڕی

زیرەکی هەر یەکێك لەمانە چەندە، لە ئەنجامی ئەو تاقیکردنەوەیەدا بۆیان دەرکەوت کە زۆربەی خەڵکی پلەی زیرەکییان ناوەندییە، هەروەها ڕێژەیەکی کەمیش پلەی نزمیان هەیە وەکو ئەم وێنەیە.

**دابەشکردنی جەرەسی**




کەواتە بەگوێرەی ئەو دابەشکردنە و پێناسەکە، بۆمان دەردەکەوێت کە بە ڕێژەی لە ١٣٪ لە منداڵان کە پلەی زیرەکییان بەرزترە و هەروەها بەڕێژەی لە ١٣٪ لەو کەسانەی کە پلەی زیرەکییان نزمترە بەر خانەی پەروەدەی تایبەت دەکەون.

کاتێك قوتابی لە تەمەنی (٦) ساڵییەوە دەچێتە قوتابخانە، دەست دەکات بەخوێندن و مامۆستاش بە ئاسانی دەتوانێت دەستنیشانی هەردوو کۆمەڵە بکات پێویستە



ئەوانەش جیا بکرێتەوە لە قوتابیانی ئاسایی، چونکە لە هەردوو باردا گیروگرفت بۆ پرۆسەی پەروەردە پەیدا دەبێت، بۆ نموونە ئەو قوتابییەی کە زیرەکە و دەتوانێت بە ئاسانی بابەت لە دەمی مامۆستا وەربگرێ، جارێکی تر ئامادەی ئەوە نییە گوێ لە مامۆستا بگرێتەوە، چونکە پلەی ژیری بەرزە و ئەو پرۆگرامەی کە دەیخوێنێ لە ئاستیدا نزمترە، هەر زوو لە وانەکە بێزار دەبێت و گیروگرفت لەگەڵ هاوپۆلەکانیدا دەخوولقێنێ، بەمەش دەبێتە هۆی تێکچوونی زنجیرەی بیری قوتابییەکانی تر و دووچاری سەرلێشواندنیان دەکات، ئەوە لە لایەك کە کار لە هەموو قوتابییان دەکات و بەرژەوەندی گشتی تێکدەچێ، لە لایەکی تر زیان بەخۆی و کۆمەڵ دەکەوێت، چونکە ئەو قوتابییە خاوەن بەهرەیەکی زگماکییە و دەبێت ژینگەیەکی وای بۆ دروست بکەین کە پەرە بە بەهرەیەکەی بدرێت، لەبەرئەوەی ژینگە یەکێکە لە تایبەتمەندییەکانی مرۆڤی زیرەك و لێهاتوو، هیچ گومان نییە کە مرۆڤی بەتوانامان تێدا هەڵکەوتووە بەڵام لە زووەوە هەستمان بە پەروەردەی تایبەت نەکردووە ئەو خاوەن بەهرانە شوێنەواریان نەماوە، زانایان و لێکۆڵەرەوەکان جیاوازییان هەیە لە بیر و بۆچوون لەبارەی مرۆڤی زیرەك و لێهاتووەوە، هەروەها جیاوازن لەسەر ئەو هۆکارانەی کە بەکاری دەهێنن بۆ دەستنیشانکردنی مرۆڤی زیرەك.

زانا (لویس ترمان) کە بە پێشەنگی ئەم گۆڕەپانە دادەنرێت یەکەمین لێکۆڵینەوەی درێژخایەنی ڕێکوپێکی لەو بوارەدا ئەنجام دا کە (٣٥) ساڵی خایاند و گەیشتە ئەو بڕوایە هەر کەسێك ڕێژەی زیرەکی لە ١٣٥٪ زیاتر بێت لەسەر پێوەری (ستانفورد — بینیە) بۆ زیرەکی، بەڵام هەندێکی تریان لە زانایانی دەروونزانی وەکو (دنلاب) مرۆڤی زیرەکی بەسەر (٣) ئاستدا بەم شێوەیە دابەشی کردووە:

**کۆمەڵەی زۆرباش:** ئەم کۆمەڵەیە ڕێژەی زیرەکییان لە نێوان (١٣٥ — ١٤٠)ە ئەگەر هاتوو پێوەری ستانفورد — بینیەیان لەسەر بەکار بهێنین.

**کۆمەڵەی بەرزتر لە زۆر نایاب:** ئەوانەش ڕێژەی زیرەکییان لە نێوان (١٤٠ — ١٧٠) بەگوێرەی هەمان پێوەر.

**کۆمەڵەی عەبقەری:** لە هەردوو کۆمەڵەی پێشوو ئاستی بەرزترە و رێژەی زیرەکی ئەو کۆمەڵەیە لە ١٧٠٪ بەرەو سەرەوەیە، رێژەی ئەو منداڵانەی کە دەگەنە پلەی عەبقەری لە نێوان ( ٠,١٪ هەتا ٠,٠٠١٪ ) دایە .

بەشێکی تر لە دەروونزانان زیرەکی دەگەڕێننەوە بۆ کێشی دەماغی مرۆڤ، دەماغی مرۆڤی ئاسایی بریتییەلە (١٤٠٠) گرام، بەڵام ئەوانەی کێشی دەماغیان لە (٨٠٠) گرام کەمتر بێت، ئەوانە کەم عەقڵن، وە هەندێکی تر کێشی دەماغیان گەلێك لەو رێژەیە بەرزترە ئەوانە لە پلەی زۆر زیرەك و عەباقرەدان بۆ نموونە مێشکی شوبرت ١٤٢٠ گرام بووە، بستر ١٥١٨ گرام، کوفییە ١٨٣٠ گرام، تورجنیف ٢٠١٢ گرام بووە.

کەواتە پەیوەندی پتەو هەیە لەنێوان زیرەکی و دەماغدا کە ئەوەش پەیوەندی بە کیمیای دەماغەوە هەیە، کە هەندێك لە لێکۆڵینەوەکان سەرکەوتنیان بەدەست هێناوە ە جیاکردنەوەی کیمیای دەماغی لە مشکدا، مشکی زیرەك و مشکی نازیرەك بەهۆی جۆرە (ئەنزیم)ێك کە بەناوبانگە بە (کولی ناستیراز Cholinasterase) لەنێو ئەو پۆلێنکردنانەدا پێوەری ستانفورد — بینییەمان بەرچاو دەکەوێت، بۆیە بە پێویستی دەزانم پێناسەی ئەو پێوەرە بکەین.

(ئەلفرێد بینیە) (١٨٥٧ — ١٩١١) دەروونزانێکی فەڕەنسییە کە یەکەم داهێنانی زیرەکی لە ساڵی (١٩٠٤) ئەنجام دا لەسەر داواکاری و پێشنیاری وەزیری پەروەردەی فەڕەنسا، بۆ چارەسەرکردنی گیروگرفتی ئەو منداڵانەی کەم ژیرن، بینیە و یارمەتیدەرانی، ئەو منداڵانەی کە دەتوانن سوود لە خوێندنی قوتابخانەی ئاسایی وەربگرن لەگەڵ ئەو منداڵانەی کە ناتوانن سوود لە خوێندنی ئاسایی وەربگرن تاقیکردنەوە. لە پاشان لە ساڵی ١٩١٦ زانای ئەمریکی (لویس تیرمان) لە زانکۆی ستانفۆرد پێوەری زیرەکی بینیەی گواستەوە بۆ ئەمریکا کە ئەوکاتە پێشوازییەکی زۆری لێکرا، دەستکاریکردنێکی پێوەرەکەی بینیەی کرد و پێوەرێکی تری دانا بۆ زیرەکی و ناوی لێنا پێوەری (ستانفورد — بینیە) کە ناوی زانکۆی ئەمریکی، بینیە



زانای فەڕەنسی بەناوبانگە. لویس تیرمان ئەم پێوەرەی داڕشت و لەسەر بنچینەی پەیوەندی نێوان تەمەنی عەقڵی و تەمەنی ساڵ، رێگەی بینیەی فەرامۆش کرد کە لەسەر بنچینەی جیاوازی نێوان دوو کەس بوو. پوختەی رێژەی زیرەکی ستانفورد بینیە پێکهاتوو لە تاقیکردنەوە، هەر تاقیکردنەوەیەك لە تاقیکردنەوەکان ژمارەی دوو مانگی بۆ دەکەین، ئەگەر هاتوو لە شەش تاقیکردنەوە یاخود شەش پرسیار سەرکەوت ئەو شەش پرسیارە بەرامبەر ساڵێکە چونکە یەك پرسیار بەرامبەر دوو مانگە، شەش پرسیار دەکاتە دوازدە مانگ، واتە ساڵێك، بەمەرجێك ئەو پرسیارانەی ئاراستەی دەکرێت لە ئاستی تەمەنیدا بێت، بۆ نموونە منداڵێکی تەمەن حەوت ساڵی، شەش پرسیاری ئاراستە دەکرێت دەبێت شەش پرسیارەکە لە ئاستی تەمەنیدا بێت، لێرەدا ئەو حەوت ساڵییە دەبێتە تەمەنی بنچینەیی لە هەمان کاتدا ئەگەر ئەو منداڵە حەوت ساڵییە بتوانێت وەڵامی پرسیاری ئاستی تەمەنی خۆی بداتەوە، کەواتە بە ئاسانی دەتوانێ پرسیاری لە ئاستی خۆی نزمتر وەڵام بداتەوە، پاشان بۆ زانینی ئاستی عەقڵی ئەو منداڵە پرسیاری قورس و گرانتری کە لە ئاستی بەرزتر بێت لێ دەکرێت، بەو شێوەیە هەتا دەگاتە رادەیەك کە ناتوانێ هیچ پرسیارێك وەڵام بداتەوە، لەو ئاستەدا رایدەگرین کە پێی دەڵێن سنووری بەرەو ژوور یاخود بەرز، لێرەدا تەمەنی عەقڵی ئەو منداڵە کە تاقیکردنەوەمان لەسەر ئەنجام داوە بە مانگ دەژمێرین و کۆی دەکەینەوە، لەگەڵ تەمەنی بنچینەیی بۆ زیاتر روونکردنەوە ئەو نموونەیە دەهێنینەوە:-

سالار قوتابییەکی تەمەن حەوت ساڵانە، بۆ ئەوەی بزانین تەمەنی عەقڵی چەندە تاقی دەکەینەوە؟ شەش پرسیاریان ئاراستە کرد هەمووی زانی، پاشان شەش پرسیاری ترمان لێ کرد کە پرسیارەکان گرانتربوون لە ئاستی تەمەنی هەشت ساڵیدا بوون، بەڵام توانی پێنج پرسیار وەڵام بداتەوە، بۆ جارێکی تر شەش پرسیاری ترمان ئاراستە کرد، توانی سێیان وەڵام بداتەوە کە پرسیارەکان لە ئاستی تەمەنی نۆ ساڵیدا بوون، ئینجا پرسیاری گرانترمان ئاراستە کرد کە لە ئاستی دە ساڵیدا بوون توانای وەڵامدانەوەی سێ پرسیاری هەبوو ، ئینجا بەهەمان شێوە شەش پرسیاری ترمان ئاراستە کرد لە ئاستی تەمەن

یازده ساڵی، توانای وەڵامدانەوەی یەك پرسیاری هەبوو، جارێکی تر پرسیاری تەمەن دوازده ساڵیمان ئاراستە کرد، نەیتوانی وەڵامی هیچیان بداتەوە، لێرەدا لەو ئاستە رادەوەستین، تەمەنی دوازده ساڵی تەمەنی بەرزە و تەمەنی حەوت ساڵیش بنچینەییە، کەواتە تەمەنی عەقڵی جیاوازە لەو ساڵانەی کە تاقیکردنەوەی تەمەنیان لەسەر ئەنجام دا، جا بۆ دۆزینەوەی تێکڕای تەمەنی عەقڵی پەنا دەبەینە بەر ئەم یاسایە، تەمەنی بنچینەیی حەوت ساڵ بوو، بۆ هەر تاقیکردنەوەیەکیش دوو مانگمان دانابوو.

٧ × ١٢ + ١٢ × ٢ = ١٠٨ مانگ.

١٠٨ ÷ ١٢ = ٩ ساڵ.

کەواتە تەمەنی عەقڵی سالار = ٩ ساڵ ئەگەر تەمەنی بە ساڵ بێت.

بۆ دەرهێنانی رێژەی زیرەکی = تەمەنی عەقڵی / تەمەنی ساڵ × ١٠٠

٧/٩ × ١٠٠ = ١٢٨ رێژەی زیرەکی سالار

بەم شێوەیە دەبینین رێژەی سالاری قوتابی ١٢٨٪ بە گوێرەی پۆلێنکردنەکەی تیرمان ئەو قوتابییە دەکەوێتە خانەی زۆرباشەکان، ئەمە پێوەری زیرەکی (ستانفورد — بینیە)یە هەر ئەو نموونەیەی سەرەوە لەسەر **محەممەد** و ئەحمەد تاقی بکەینەوە، **محەممەد** قوتابییەکە تەمەنی عەقڵی نۆ ساڵە، هەروەها تەمەنی بە ساڵیش هەر نۆیە، بۆمان دەردەکەوێ رێژەی زیرەکی **محەممەد** لە ١٠٠٪ چەندە؟

رێژەی زیرەکی **محەممەد** = تەمەنی عەقڵی — تەمەنی بە ساڵ * ١٠٠

١/٩ — ١/٩ × ١٠٠ = ١٠٠ رێژەی زیرەکی **محەممەد**

بەڵام قوتابی ئەحمەد تەمەنی عەقڵی نۆ ساڵە وەکو لە نموونەکەی سەرەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت بەڵام تەمەنی بە ساڵ شەش ساڵ و نۆ مانگە، بۆمان بەدیار دەکەوێت کە رێژەی زیرەکی ئەو قوتابییە زیاترە، چونکە تەمەنی عەقڵی هەردووکیان نۆ ساڵ بوو، بەڵام تەمەنیان بە ساڵ جیایە بۆیە رێژەی زیرەکییان جیاواز دەبێت.

رێژەی زیرەکی = تەمەنی عەقڵی — تەمەنی بە ساڵ × ١٠٠

٩ — ٦,٩ × ١٠٠ = ١٣٠ رێژەی زیرەکی ئەحمەد.



جگە لە پێوەری ستانفورد — بینیە، پێوەری زیرەکی ترمان هەیە وەکو پێوەری (وکسلر) کە تایبەتە بە منداڵان لە نێوان (٥ — ١٠) ساڵان هەروەها بۆ هەرزەکار بە تەمەنەکانیش بەشێوەیەکی فراوانتر بەکار دێت، کە ئەمەیان بەناوبانگترین پێوەرە لە ئەمریکا پێوەری (وکسلر) بریتییە لە تاقیکردنەوەی زارەکی لە زانیاری گشتی و ژمێرە و شتی وێکچوو، هەروەها بەشی دووەمی پێکهاتووە لە شتی فیکری، وەکو تەواوکردنی وێنە، هەروەها ریزکردنی ژمارە بەشێوەیەکی ریزبەندی.

ئەم خشتەیە پۆلینکردنی رێژەی زیرەکییە لە پێوەری (وکسلر)

| ژ | رێژەی زیرەکی | پۆلین | رێژەی ٪ |
|---|---|---|---|
| ١ | زیاتر — ١٣٠ | زۆر بەرز | ٢,٢ |
| ٢ | ١٢٠ — ١٢٩ | بەرز | ٦,٧ |
| ٣ | ١١٠ — ١١٩ | زیرەکی ئاسایی | ١٦,١ |
| ٤ | ٩٠ — ١٠٩ | زیرەکی مامناوەندی | ٥٠,٠ |
| ٥ | ٨٠ — ٨٩ | کەم عەقڵی ئاسایی (غبی) | ١٦,١ |
| ٦ | ٧٠ — ٧٩ | لە خوار کەم عەقڵی ئاسایی | ٦,٧ |
| ٧ | کەمتر — ٦٩ | بێ عەقڵ | ٢,٢ |
| پێوەری زیرەکی وکسلر | | | ١٠٠٪ |

کەواتە ئەم پۆلینەی وکسلر، پاڵپشتێکی بەهێزە بۆ دابەشکردنی جەرەسی وەك لە وێنەی (١) بەدیارکەوت.

رێژەی ئەو کەسانەی پلەی زیرەکییان لە سەرووی مامناوەندییە یەکسانە بەو کەسانەی کە پلەی زیرەکییان لە خوار مامناوەندییە، جگە لەم پێوەرانە هی تریشمان هەیە کە ژمارەیان دەگاتە نزیکەی (١٠٠) پێوەرە کە پسپۆران و

دەروونزانەکان بەکاری دەهێنن بۆ زانینی پلەی زیرەکی. وەکو تاقیکردنەوەی کەشتی کە پێکهاتووە لە چەند پارچە دارێك کە کەشتی لێ دروست کراوە، دارەکان پارچە پارچە دەکەین و پاشان داوا لە قوتابی دەکەین کە سەرلەنوێ دروستی بکاتەوە، لە هەمان کاتیشدا ماوەی بۆ دیاری دەکەین، هەروەها تاقیکردنەوەی (هلی) کە بریتییە لە میکانۆ لە چەند پارچە پێکهاتووە بۆ ئەوەی وێنەیەکی لێ دروست بکات، یاخود هەر پارچەیەکی ئەو وێنەیە لە شوێنی خۆی دابنێتەوە و ڕەچاوی خێرایی و وردبینی دەکرێ هەمانە تاقیکردنەوەی کۆمەڵی، ئەوەش پێکهاتووە لە کۆمەڵە کەسێك کە چەند کارێکی وەکو یەکیان دەدەینێ، هەر کەس بە جیا ئەنجامی دەدات، کامیان بەخێراتر و جوانتر ئەنجامی بدات، ئەوا ڕێژەی زیرەکی زیاترە، ڕەنگە کەسانێك پرسیار بکەن و بڵێن سوود و بەرژەوەندی کرداری تاقیکردنەوەی زیرەکی لە چ دایە؟ یان بە مانایەکی تر، ئایا مەبەست لە پێوەری زیرەکی چییە کە زانایان هێندە خۆیان پێوە خەریك کردووە؟

لە وەڵامدا دەڵێین زانینی پێوەری زیرەکی گەلێك گرێ کوێرەمان بۆ دەکاتەوە، هەروەها گەلێك ڕێگای دوورمان بۆ نزیك دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بتوانین پاشەڕۆژێکی گەش و ڕووناك بۆ نەتەوەکەمان دابین بکەین و دەشتوانین لەم چەند خاڵەدا سوودەکانی پێوەری زیرەکی پیشان بدەین:

دەتوانین لە ڕێگای دۆزینەوەی پێوەری زیرەکی بەهرە و توانای ئەو منداڵانە بدۆزینەوە، سوود لە توانا و وزەیان وەربگرین، هەوڵیش بدەین پرۆگرامی تایبەتیان بۆ ئامادە بکەین بۆ ئەوەی بەهرەیان بەفیڕۆ نەڕوا.

ناسینی ئەو قوتابییانەی کەم ژیرن، ئەوانیش لە قوتابخانەی تایبەتی دابمەزرێن بە گوێرەی توانا و لێهاتووییان سوودیان لێ وەربگیرێ لەمەش گرینگتر ئەوەیە لە کۆڵان و شەقامەکاندا ڕزگاریان بکەین، بۆ ئەوەی نەبنە گاڵتەجاری خەڵکی، چونکە کۆمەڵ تێڕوانینی خراپی بەرامبەر ئەو کەسانە هەیە.



پۆلینکردنەی هەریەك لەو قوتابییانە بەگوێرەی توانستی عەقڵیان بۆ ئەوەی کار لە یەکتری نەکەن، دیارە قوتابییەکی کەم ژیر ناتوانێت وەکو قوتابییەکی مامناوەندی بابەت وەربگرێ، ئەگەر بێتو لەگەڵ یەکدا پرۆگرام بخوێنین، کار لە یەکتری دەکەن و بەشێوەیەکی خراپ بەسەر قوتابییە مامناوەندییەکە دەشکێتەوە.

یارمەتیدانی تاکە کەس لە ڕووبەڕووبوونەوەی هەر گیروگرفتێکی کەسایەتی و کۆمەڵایەتی لە لایەن پەروەردەکارانەوە، ئەگەر هاتوو مامۆستا یاخود پەروەردەکار زانی پلەی زیرەکی قوتابی چەندە، دەتوانێت ڕێگاچارەی گونجاو بدۆزیتەوە.

ئاراستەکردنی قوتابی بۆ خوێندنی پیشەیی، دیارە هەر قوتابییەك توانای هەیە لە زمانی ئینگلیزی، بۆ نموونە ئێمە دەبێت ئاراستەی بکەین بۆ تەواوکردنی خوێندنی زمانی ئینگلیزی، ئێستا گەورەترین گیروگرفتی دەرچوانی فێرکردنی ئامادەیی ئەوەیە، کاتێك ئامادەیی تەواو دەکەن، ناچێتە کۆلێژێك کە لەگەڵ بەهرە و توانای ئەودا بگونجێت، بەڵکو دەچێتە شوێنێکی تر کە تێدا بەهرەمەند نابێت، لێرەدا ئەو ئەرکە دەکەوێتە سەر مامۆستایانی ڕابەری پەروەردەیی پێویستە ئەو بەڕێزانە لە نزیکەوە ئاگاداری قوتابییان بن و شتی زانستی ڕێکوپێکیان ئاراستە بکەن، نەك لەسەر بنچینەی چەوت کە لە پاشەڕۆژدا زیان بەخۆی و میللەتەکەی بکات.

## کاریگەری ژینگە و بۆماوە لەسەر زیرەکی:

زانایانی دەروونزانی پلەی جیاوازی زیرەکی دەگەڕێننەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی یەکەمیان بۆماوە و دووەمیان ژینگە کە هەر یەکێك لەوانەش کار لە کاردانەوەی مرۆڤ دەکەن، جا ئەو کارلێکردنە دەرەکی بێت یان کارلێکەری ناوخۆ بێت مەسەلەی ژینگە و بۆماوە تاوەکو ئێستا لای زانایانی دەروونزانی یەکلا نەبۆتەوە و قسەی زۆری لەسەرە، هەندێك پێیان وایە تەنها ژینگە هۆکاری سەرەکییە لەسەر گەشەی مرۆڤ، جا ئەم گەشەکردنە جەستەیی بێت یان زیرەکی یان کۆمەڵایەتی... هتد، وەکو قوتابخانەی ڕەفتاری ئەمەریکی کە زانا (واتسن) ڕێبەرایەتی دەکات و یەکێك لە قسە

بەناوبانگەکەی ئەوەیە (١٠ منداڵی لەش ساغم بدەرێ چۆنت بوویێت وایان دروست دەکەم هونەرمەند، زانا، بازرگان، پیاو خراپ و چاوپۆش لە مەیل و بەهرە و رەچەڵەکی دەکەین)، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن بۆماوە هۆی سەرەکییە لەسەر گەشەی مرۆڤ چینی سێیەمیش دەڵێن هەریەك لە ژینگە و بۆماوە شان بەشانی یەکتر دەڕۆن، هەردووکیان بەیەکەوە بەشدارن لە دروستکردن و پێکهاتەی مرۆڤ هەرگیز ناتوانین لە یەکتریان جیا بکەینەوە، ئەگەرچی زانایان سوورن لەسەر ئەوە کە کاریگەری هەریەك لەوانە جیا بکەنەوە بۆ رۆشنایی زیاتر، بە جیا باسیان دەکەین.

## هۆکاری بۆماوە

بۆماوە زانستێکە گرینگی بە گواستنەوەی سیفەتەکانی بایلۆژی لە دایك و باوکەوە بۆ نەوەکانی پاش خۆیان دەدا، یان گواستنەوەی سیفەتەکان لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر.

**کاریگەری بۆماوە لەسەر پلەی زیرەکی منداڵ لە دوو سەرچاوە خۆی دەبینێتەوە:**

بوونی ئەو پەیوەندییە رێگەی لەنێوان شێوەکانی بۆماوەی نائاسایی و شێوەکانی تاقیکردنەوەی عەقڵی، بۆ نموونە کەمی کرۆمۆسۆمی (x) یاخود (y) کۆرپە تووشی کۆمەڵێك کەموکوری دەبێت کە پێی دەڵێن (Thmers Syndrome) کە ئەو پەیوەندییە بە ئاستێکی زۆر کار لە توانستی زارەکی دەکات یاخود بە پێچەوانەوە زۆری کرۆمۆسۆم لە سنووری خۆی واتە (٤٦) کرۆمۆسۆم ببێتە (٤٧) کە بەناوبانگە بە منداڵی مەنغۆلی و تووشی کەم عەقڵی دەبن.

ئەو لێکۆڵینەوانەی ئەنجام دراون لەسەر چەند خێزانێکی سپی پێست کە پلەی گوزەرانیان ناوەندی بوو، بۆیان دەرکەوت هەرچەندە پلەی پێکچوونی بۆماوە زیاد بێت پلەی زیرەکییان پێکدەچێت، بە پێچەوانەی ئەوە دوو کەس کە بۆماوەیان لە یەك جیا بێت با لەگەڵ یەکیشدا پەروەردە بکرێن، واتە یەك ژینگەیان هەبێت بۆیان دەرکەوت جیاوازی لە پلەی زیرەکییان لە یەکتری جیایە، یاخود ئەو دوو منداڵە جمکەی کە لە یەك هێلکە کەرت



بووینە پاش لەدایکبوون لە دوو ژینگەی جیا پەروەردە بکرێن، سەیر دەکەین پلەی زیرەکییان لە یەکەوە زۆر نزیکە، جا وەنەبێت ئەو لێکۆڵینەوانەی کە کراوە گرنگی بۆماوە بەدیارکەوتنی لە نرخ و بەهای ژینگە کەم بکاتەوە، چونکە لە سەرەتادا گوتمان ژینگە شان بەشانی بۆماوە دەڕوا و زۆر لێکۆڵینەوەش لەسەر کاریگەری زیرەکی ئەنجام دراون و گرنگی ژینگە دەستنیشان دەکەن، بۆ نموونە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەی کراوە لەسەر ئەو خێزانانەی کە دەرامەتیان نزمە، ئاستی زیرەکییان بەرێژەی (٢٠ — ٣٠) کەمترە، لەو خێزانانەی کە دەرامەتیان بەرزە، ئەمەش بە روونی و ئاشکرا بەدیار دەکەوێ، ئەو خێزانانەی کەم دەرامەتن تووشی بەدخۆراکی دەبن، بەتایبەتیش ئەو ئافرەتانەی سکپڕن، بەهۆی بەدخۆراکییەوە کار لە کۆرپەی ناو سك دەکات و لەش بە شێوەیەکی رێك گەشە ناکات، هەروەها ئەو دایك و باوکەی گیروگرفتی نەبوونیان هەیە هەردەم دڵەڕاوکێیان هەیە، ناپرژێنە سەر ئەوەی کاتێکی دیاریکراو بۆ منداڵەکانیان تەرخان بکەن، بۆ ئەوەی پەرە بە توانستی عەقڵی منداڵەکانیان بدەن، هەروەها لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە هەردوو دەروونزانی رەفتاری (ریك هیبر، هوارد جاربر) ئەنجامیان داوە گەیشتنە ئەو راستییەی کە ئەو دایکانەی رێژەی زیرەکییان کەمترە لە پلەی ٨٠٪ پەروەردە و پێگەیاندنی منداڵەکانیان بەرێژەی لە ٧٨,٢٪ ئەنجام دەدەن و منداڵەکانیشیان رێژەی زیرەکییان لە ٨٠٪ کەمتر دەبێت، (ریك هیبر و هوارد جاربر) تاقیکردنەوەیەکیان لەسەر (٤٠) دایك کە رێژەی زیرەکییان لە ٧٠٪ کەمترە کرد، لە پاشان ئەو (٤٠) ئافرەتەیان بە شێوەی تێکەڵاو بەسەر دوو کۆمەڵە دابەش کرد، کۆمەڵەی یەکەم کە پێکهاتبوو لە (٢٠) دایك لەژێر چاودێری دابوون فێری ئەوە کران کە چۆن منداڵەکانیان پەروەردە بکەن و، چۆن چاودێری تەندروستییان بکەن. هەروەها پرۆگرامی تایبەتییان بۆ منداڵەکان دانا بۆ رووژاندنی کرداری هەستی، زمان، بیرکردنەوە، فیکری، بەڵام کۆمەڵەی دووەم هەروەکو خۆی مانەوە تاکو تەمەنی ٥,٥ واتە ساڵی پێش چوونە قوتابخانە، ئەو دوو زانایە بۆیان دەرکەوت کە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکە بەو شێوەیە بوو، کۆمەڵی یەکەم کە تاقیکردنەوەیان لەسەر ئەنجام درا، رێژەی زیرەکییان گەیشتە (١٢٤٪) بەڵام کۆمەڵەی دووەم رێژەی زیرەکییان لە

(٩٤٪) بوو، هەروەها مامۆستاش لە قوتابخانەدا دەتوانێت بەشداری لە بەرزکردنەوەی پلەی زیرەکی قوتابی بکات لە ئەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەی کە هەردوو دەروونزان (ڕۆزینتال و لینو جاکیسون) لە ناوەڕاستی شەستەکاندا لە یەکێك لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی ناوچەیەکی هەژاری باشووری سان فرانسیسکۆ ئەنجامیان دا، بەدەستنیشانکردنی لە ٢٠٪ بەشێوەیەکی تێکەڵاو لە هەموو قۆناغەکانی خوێندندا، پاشان ناوی ئەو قوتابییانەیان دا بە مامۆستاکان و ناویان نان (خاوەن توانای عەقڵی) مامۆستاکان لە هزر و بیری خۆیاندا چاوەڕوانی پێشکەوتنیان لەو قوتابییانە دەکرد، پاش هەشت مانگ، هەردوو زانا گەڕاوەتەوە لای قوتابییەکان قوتابییەکانیان تاقی کردەوە و گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە پێشکەوتنێك لە قوتابییەکان رووی داوە بە ڕێژەی چوار پلە لە چاو جاری پێشوو، ئەگەرچی پلەیەکی زۆر نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا شتێکی گرنگە بۆ کاری مامۆستا کە بەشدار دەبێت لە بەرزکردنەوەی پلەی زیرەکی. بە کورتی هەریەك لە ژینگە و بۆماوە، کاریگەری خۆیان هەیە لە بەرزی و نزمی ڕێژەی زیرەکی منداڵ.

## خاسیەتەکانی مرۆڤی عەقڵ بەرز و بلیمەت:

پسپۆر و شارەزایان لە بواری پەروەردە و دەروونزانیدا گرنگییەکی زۆریان بە لێکۆڵینەوەی خاسیەتەکانی مرۆڤی بلیمەت داوە، بەناوبانگترینیان لێکۆڵینەوەی زانا (لویس ترمان)ـە، لێکۆڵینەوەیەکی درێژخایەنی لە ساڵی ١٩٢١ هەتا ساڵی ١٩٥٦ لەسەر کۆمەڵێك منداڵی بلیمەت ئەنجام دا کە ڕێژەی زیرەکییان لە ١٣٥٪ لەسەر پێوەری ستانفورد بینیە گەیشتە ئەو ئەنجامانە:

مرۆڤی زیرەك و لێهاتوو زیاتر گەشەی لەشی و کۆمەڵایەتی پێوە دیارە، وەك لە مرۆڤی ئاسایی.

ئەو منداڵانە لە ژیانی رۆژانەیاندا دەتوانن بگەنە ئاستێکی بەرز لە خوێندن، ئەگەر بێتو بەراوردیان بکەین لەگەڵ منداڵانی ئاسایی، هەروەها بۆیان دەرکەوت ڕێژەی لە ٥٠٪ی ئەو منداڵانە کە زیرەکییان ١٣٥ پلەیە دەتوانن ئاستی خوێندنیان خێراتر



تەواو بکەن لەگەڵ ئەو منداڵانەی هاوتەمەنی خۆیان بە دوو پۆلی یان سێ پۆلی قۆناغی خوێندن، هەروەها ئەو منداڵانە گەشەی عەقڵیان بەردەوام دەبێت هەتاکو تەمەنیان دەگاتە (٥٠) ساڵی.

خۆگونجاندنی ئەو منداڵانە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بەرزترە لە منداڵانی ئاسایی بە ڕێژەی لە ٩٣٪ هاوسەرێتیان دروست کرد و توانییان بە ڕێژەی لە ٨٥٪ لەگەڵ یەکتری ژیان بەسەربەرن و بە ڕێژەی لە ٦٪ بەختیارییان کەمتر بوو، ئەوەی تێبینی دەکرێ لێك جیابوونەوە لە نێوانیاندا رووی نەداوە. لە کۆنەوە بڕوا و قەناعەتی خەڵکی وابووە کە عەقڵی بەرز لەنێو ئەو کەسانەدا روودەدات کە کەموکوڕی لە لەشیان هەیە، ئەو گەشەکردنە خێرایەی زیرەکی قەرەبووی کەموکوڕییە لەشییەکە دەکاتەوە، بەڵام لە دواییدا لە ئەنجامی چەند لێکۆڵینەوەیەکدا دەرکەوت کە ئاستی گەشەکردنی لەشی مرۆڤی زیرەك و بلیمەت چاکتر و باشترە لە منداڵانی ئاسایی، هەروەها ئەو منداڵانەی لە ئاستی زیرەکیدان کەمتر لە قوتابخانە دوا دەکەون بەهۆی نەخۆشی و خراپی تەندروستییەوە، ئەمەش مانای ئەوە نییە هەر منداڵێکی زیرەك دەبێت باڵا بەرز و کێشی باش بێت لە چاو منداڵانی مامناوەندی، هەروەها ئەوەی کەمی لە گەشەی لەشی هەبێت، هەرگیز ئەوە ناگەیەنێت کە عەقڵی گەشە ناکات.

زۆرجار وا دەبێت کەسێك کەموکوڕی لەشی هەیە، بەڵام عەقڵی زۆرباش گەشە دەکات و بۆتە مرۆڤێکی عەقڵ بەرز، بەڵام خاسیەتی عەقڵی مرۆڤی زیرەك بە شێوەیەکی خێراتر و چاکتر گەشە دەکات لە چاو منداڵانی ئاسایی. ئەم گەشەکردنە بە ڕێژەی ١,٣ بۆ مرۆڤی زیرەك بەڵام بە ڕێژەی (١) بۆ منداڵانی ئاسایی، کەواتە مرۆڤی زیرەك تەمەنی عەقڵیان زۆرتر و بەرزترە لە تەمەنی ساڵیان وەکو لە ڕێژەی زیرەکی روونمان کردەوە، ڕێژەی زیرەکی زیرەکی منداڵێکی بلیمەت زیاترە لە منداڵێکی ئاسایی زانایان سنووری دیاریکراویان داناوە بە ڕێژەی (١٣٥) پلە لە نێوان منداڵی زیرەك و منداڵی ئاسایی. هەروەها منداڵی بلیمەت پێشکەوتووترن لە منداڵی ئاسایی لە گەشەکردنی زمان، چونکە زمان زووتر دەگرن و گەنجینەی زمانەوانییان دەوڵەمەندترە، ئەو لێکۆڵینەوەی زانا (کلم) کردی لەسەر

منداڵانی قۆناغی یەکەم، منداڵانی بلیمەت لە پێشەوەی هاوتەمەنەکانی خۆیان بە جیاوازی (٢ — ٤) ساڵ هەروەها دەربارەی نووسین و خوێندن، پێش ئەوەی بێنە قوتابخانە و ڕێژەی لە ٢٠٪ پێش پێنج ساڵی فێری خوێندن دەبن و لە ٦٪ پێش چوار ساڵی و لە ٢٪ پێش سێ ساڵی، منداڵێك لە تەمەنی سێ ساڵی توانای خوێندنەوەی کتێبی ساکاری هەبوو کە پلەی زیرەکی لە (١٦٠٪) بوو، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دەکرێت، ئایا ئەو منداڵانە لە کوێ فێری خوێندن دەبن؟

ژمارەیەکی کەم لەو منداڵانە بەخۆیان فێری خوێندنەوە دەبن، ئەویش بەهۆی بەستنەوەی وشەی نووسراو یاخود لە ڕێگەی وێنەوە دەتوانن شت بخوێنەوە، بەڵام خاسیەتی کۆمەڵایەتی ئەم جۆرە منداڵانە خاوەنی کەسایەتی کۆمەڵایەتین دەتوانن زۆر بە ئاسانی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەگەڵ دەوروپشتەکەیدا ڕێك بخەن، تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە ڕێژەی زیرەکییان (١,١٠) پلەیە، هەروەها لەڕووی هەڵچوونەوە دەتوانن کۆنترۆڵی دەروونی خۆیان بکەن لە هەڵوێستی جیاجیادا، هەروەها توانای هەڵگرتنی بەرپرسیارەتییان هەیە، بە شێوەیەکی ڕێکوپێك دەتوانن ئیشوکارەکانی خۆیان بە هێمنی بەڕێوە ببەن، بڕوای تەواویان بە خۆیان هەیە لە ئیشوکارەکانیاندا، لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە دەروونزان (سترانج) ئەنجامی دا بۆی دەرکەوت کە منداڵانی زیرەك ئەگەر هاتوو بە ئاشکرا گۆشەگیری پێوە دیاربوو لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە بە کەسێکی نائاسایی لە قەڵەم دەدرێت.

ئەوەی لە پێشەوە باسمان کرد، ئەو کەسانە بوون کە پلەی زیرەکییان لە مرۆڤی ئاسایی زیاترە، چاودێری پرۆگرامی تایبەتیان هەیە، وەڵام وەکو لە پێناسەکەدا گوتمان منداڵی نائاسایی یاخود پەروەردەی تایبەت تەنها ئەوانە ناگرێتەوە، بەڵکو کەم عەقڵەکانیش دەکەونە خانەی چاودێری تایبەتی پەروەردەی تایبەتمەندەوە، بۆیە پێویستە باس لە کەسایەتی ئەوانیش بکرێت، کەم ژیرەکانیش کێن بەسەر چەند پۆل دابەش دەکرێن، هۆی کەم ژیرییان چییە؟ چۆنیەتی تێڕوانینی کۆمەڵ بەرامبەر ئەو جۆرە کەسانە چۆنە؟



منداڵی کەم عەقڵ بەو منداڵانە دەگوترێ کە جیاوازییان هەیە لەگەڵ منداڵانی ئاسایی، لەبەر ئەوە پێویستیان بەچاودێری هەیە، کە ئەو چاودێریکردنە منداڵانی ئاسایی پێویستیان پێ نابێت. منداڵی کەم عەقڵ وەکو منداڵی ئاسایی گەشە دەکەن، هەروەها ناگەنە ئەو ئاستە عەقڵییەیەی کە منداڵانی ئاسایی دەیگەنێ، بۆ نموونە ئەگەر منداڵێکی ئاسایی لە تەمەنی حەوت ساڵی، بەراورد بکەین لەگەڵ منداڵێکی کەم عەقڵی لە هەمان تەمەندا، تەماشا دەکەین منداڵی دووەم ناتوانیت وەکو منداڵی یەکەم کرداری عەقڵی ئەنجام بدات، بەڵکو توانای هەیە هەروەك منداڵێکی تەمەن چوار ساڵی کارەکە ئەنجام بدات، کەواتە بە سێ ساڵ لە دوای منداڵی ئاساییەوە دێت، یاخود کەسێکی ئاسایی تەمەن (٢٠) ساڵی بەراورد بکەین لەگەڵ (٢٠) ساڵییەکی کەم عەقڵ دەبینین کەسی ئاسایی تەمەنی عەقڵی یەکسانە لەگەڵ تەمەنی ساڵی، بەڵام کەم عەقڵەکە تەمەنی عەقڵی کەمترە لە تەمەنی ساڵی و وەکو کەسێکی ئاسایی یازدە ساڵییە، پسپۆڕان لە هەوڵی ئەوەدان کە سنوورێکی سروشتی دابنێن بۆ کەم عەقڵەکان و زیاتر لێکۆڵینەوەکانیان بەرەو لایەنی فسیۆلۆژی دەڕوات، بەتایبەتی لایەنی دەماغ و مێشك، هەروەها لێکۆڵینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە کەم عەقڵی لە ئەنجامی هۆکاری ژینگەوە پەیدا دەبێت و بەهۆی بەشێکی مێشك، ئەم لەناوچوونە لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدا بێت، وەکو پێش لەدایکبوون، یاخود پاش لەدایکبوون، بەڵام هۆکاری بۆ ماوە کە خانەکانی مێشك بە شێوەیەکی ڕێك دابەش نەبووینە، بەڵکو خانەکانی مێشك لە هەندێك شوێندا بە شێوەیەکی زۆر کۆبوونەتەوە و دوورییەکی یەکسان لەنێوان خانەیەك لە خانەیەکی تردا نییە، ئەوە دەبێتە هۆی گەشەکردنی عەقڵ و ڕاوەستانی گەشەی عەقڵی.

زانایانی دەروونزانی جیاوازییان هەیە لەنێوان خۆیاندا بۆ ئەوەی بزانن سەنگی مەحەك چییە بۆ ناسینی مرۆڤی کەم عەقڵ، هەندێکیان پێیان وایە دیاردەی توانستی عەقڵی تاکە پێوەرە بۆ هەڵسەنگاندنی ناسینی مرۆڤی کەم عەقڵ، بەڵام هەندێکی تر وای بۆ دەچن کە گەشەی کۆمەڵایەتی دەبێتە سەنگی مەحەك بۆ

ناسینی ئەو جۆرە کەسانە، بەڵام هەندێك بڕوایان وایە فێربوونی تاك ڕێگایە بۆ ناسینیان، بەڵام کۆمەڵێکی تر لە زانایانی دەروونزانی بە شێوەیەکی گشتی تاکە هەڵسەنگاندنێك دەخەنە دواوە بەڵکو دەڵێن پێویستە هەموو لایەنەکان بکەینە پێوەر بۆ هەڵسەنگاندنی منداڵی کەم عەقڵ، هەریەك لەم هەڵسەنگاندنانە پێناسەی تایبەتیان هەیە کە بەکاردێت بۆ ئەوەی ببێتە سەنگی مەحەك لەسەر ئەو منداڵانە:

**توانای عەقڵی:**

ئەو زانایانە کە توانای عەقڵی دەکەنە پێوەر بۆ ناسینی کەم عەقڵەکان، دەڵێن هەریەکێك ڕێژەی زیرەکی لە (٧٠) کەمتر بوو، ئەوا بە کەم عەقڵ دەناسرێت و ڕێژەی ئەو جۆرە کەسانەش بە لە ٣٪ دەخەملێنرێ لە تێکرای دانیشتوان، بەڵام ئەوەی ئێمە لە لامان گرنگە تاکو چ ڕادەیەك پێوەری زیرەکی ئاستی عەقڵیمان بۆ دەستنیشان دەکات بۆ ئەوەی دڵمان ئاو بخواتەوە؟

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارە چاکترین هۆ کە پەنای بۆ ببەین ئەو لێکۆڵینەوانەن کە لەم بارەیەوە ئەنجام دراون، لەم لێکۆڵینەوانە کە دەروونزان (دنکن) بە تاقیکردنەوە لەسەر چەند منداڵێك ئەنجامی داوە، زیرەکی ئەو منداڵانەی پێوا لەسەر پێوەری ستانفورد — بینیە بۆی دەرکەوت کە ڕێژەی زیرەکییان لەنێوان (٤٥ — ٧٦) دایە تێکرای زیرەکییان (٦٦)ە، پاشان لەسەر هەمان کۆمەڵە منداڵی تاقیکردنەوەی کرد، بەڵام ئەمجارە لەسەر پێوەری (الازاحە اللسکندر) بۆی دەرکەوت کە ڕێژەی زیرەکییان لەنێوان (٦٧ — ١١٩) دایە و تێکرای زیرەکییان (٨٦) پلەیە، بەمانای جیاوازی ڕێژەی زیرەکیان (٢٠) پلەیە، جا بەم پێیە ئەگەر سەیر بکەین لەسەر ئەو جۆرە پێوەرانە تووشی هەندێك هەڵە دەبین لە دەستنیشانکردنی پلەی زیرەکییان و هەندێك جار مرۆڤی کەم عەقڵ بە ئاسایی دادەنێین، ئەو کەسەی پشت بەتاقیکردنەوەی زیرەکی دەبەستێت و بەکاری دەهێنن، وەکو هۆیەك بۆ دەستنیشانکردنی باری کەم عەقڵی، ئەو تاقیکردنەوانە ڕێگا خۆشکەرێکن بۆ



ئاسانکردنی ئاستی ڕێژەیی منداڵ، چونکە هەر کاتێك ئێمە باس لە پلەی زیرەکی دەکەین، مەبەستمان پلەی تەواو نییە، بەڵکو هەموو پێوەرەکانی دەروونزانی ڕێژەییە، دیارە جیاوازی هەیە لەنێوان پلەی گەرمی پێو لەگەڵ زیرەکی منداڵ.

**٢- دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی:**

مەبەست لە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی، توانای تاکە کەس بۆ بنیاتنان و دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتیی لەگەڵ کەسانی دەوروپشت و بەشداریکردنە لە پێکەوە ژیان، هەر کاتێك مرۆڤ لەڕووی جەستەیی و عەقڵی و دەروونی گەشەی ڕێکوپێك بێت، بەڵگەیە لەسەر گەشەکردنی کۆمەڵایەتی.

منداڵ کە گەشەی کۆمەڵایەتی هەبوو، فێر دەبێ چۆن بنیادی پەیوەندی خۆی لەگەڵ دایك و باوك و خێزانەکەی دروست بکات و وردە وردەش پەیوەندییەکان لەگەڵ دراوسێکانی، بەشداری دەکات لەگەڵ منداڵی گەڕەك و کۆڵان لە یاری و چالاکییە جیا جیاکاندا، پاش ئەو قۆناغەش دەپەڕێتەوە قۆناغی قوتابخانە لە چالاکییەکانی قوتابخانەش بەشداری دەبێت وەکو یاری گۆڕەپان، هونەری شێوەکاری و تیپی هونەری و مۆسیقا... هتد.

زانا (ترید جولد) دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی دەکاتە سەنگی مەحەك بۆ کەم عەقڵی، بەوە پێناسەی دەکات تەواو نەبوون و گەشەنەکردنی عەقڵی بەڕادەیەك وا لە مرۆڤ دەکات کە نەتوانێ خۆی بگونجێنێ لەگەڵ ژینگە، مرۆڤی ئاسایی بەشێوەیەکی وا کە هەموو کاتێك پێویستی بە چاودێری و سەرپەرشتی خەڵکان هەبێت، بەو مانایە ئەگەر مرۆڤ دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی کز و بێ هێز بوو، ئەوا بە کەم عەقڵ دادەنرێت، هەر کاتێك (ترید جولد) باس لە لایەنەکانی تر دەکات ئەگەر ڕێژەی زیرەکییان لە (٩٠ — ١٠٠) کەمتر بێت بە کەم عەقڵ ناویان دەبات، بەڵام هەندێك لە لایەنەکانی بە کەم عەقڵ دانانێت، ئەگەر ڕێژەیان لە (٧٠) کەمتر بێت.

(دۆل) بۆ ئەوەی هەندێك لە کەموکوڕییەکانی (ترید جول) ڕاست بکاتەوە کە دەسەڵاتی کۆمەڵایەتی کردۆتە سەنگی مەحەك و هەوڵی ئەوەی داوە بەشێوەیەکی وردتر پێوەری گەیینی کۆمەڵایەتی بەم شێوە داناوە:

نەبوونی توانای کۆمەڵایەتی، کە ناتوانێ ئیشوکاری خۆی بەڕێوە ببات.
لەڕووی عەقڵییەوە کەمترن لە منداڵانی تر.
دواکەوتنی عەقڵییان لە کاتی لەدایکبوون یاخود لە قۆناغی منداڵی دەست پێدەکات.
دواکەوتنی عەقڵییان دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری پێکهاتن یان بۆماوە یاخود ئەنجامی نەخۆشی.
ئەو دواکەوتنە عەقڵییە چاك نابێتەوە.

## هۆکارەکانی دواکەوتنی عەقڵی:

زانایانی دەروونزانی هۆیەکانی تووشبوونی کەم عەقڵی بۆ گەلێك هۆکار دەگێڕنەوە و هەریەکەشیان راوبۆچوونێکی لێکۆڵینەوەی زانستی خۆیان هەیە لە نزیکەی (١٠٠) لێکۆڵینەوە زیاتر هەیە لەسەر هۆی تووشبوون بە نەخۆشی کەم عەقڵی، بەڵام بەشێوەیەکی سەرەکی هۆکارەکان بۆ سێ بەشی سەرەکی دەگەڕێتەوە:

**هۆکاری پێش لەدایکبوون:**

ئەو هۆکارەیە کەوا دەکات منداڵ تووشی کەم عەقڵی بێت پێش لەدایکبوون و لەو ماوەیەشدا هۆکارەکان زۆرن و جیاوازن کە هەیانە بۆماوەییەکەی کەم عەقڵی لە رێگای (جینات)ەوەیە، کە ئەوانە تەنی هەستیارن و هەڵگری سیفاتی بۆماوەیین، هەشە بەشێوەی بۆماوەیی نییە، بەڵکو بازدان رووەدەدات لە کاتی دروستبوونی جینات، هەروەها سەرهەڵدانی گەلێك پەشێوی فسیۆلۆژی وەکو پەشێوی ئەنزیم کە دەبێتە هۆی لەناوچوونی خانەکانی مۆخ، بە لەناوچوونی خانەکانی مۆخ کەم عەقڵی رووەدەدات، یاخود بە ژەهراوییبوونی دایك لە کاتی سکپڕیدا، ئەمانە هەمووی هۆکارن لە کاتی سکپڕیدا وا دەکات منداڵ تووشی کەم عەقڵی بێت، هەروەها هۆکاری (Rh) کە یەکێکە لە هۆکارەکان بەناوی مەیمونێك (Rheshs monkey) کە بۆ یەکەمجار لە خوێنی ئەو مەیمونە دۆزرایەوە، لێکۆڵینەوەکانی



شیکردنەوە بەدیاریان خستووە لە (٨٦٪)ی مرۆڤ خوێنیان پێکهاتووە لەو جۆرە خوێنە (Rh +) و رێژەی لە (١٤٪)ی مرۆڤ خوێنیان (Rh-)ە، جا ئەو کاتەی جیاوازی نێوان خوێنی دایك و کۆرپە دەبێتە هۆی نەگەینی خانەکانی خوێن، ئەوەش کار لە دروستبوونی مۆخ دەکات بۆ نموونە ئەگەر هاتوو خوێنی دایك (Rh -) بوو، خوێنی باوك (Rh +) ئەوا خوێنی کۆرپە (Rh +) دەبێت و بۆماوەیی لە باوك وەردەگرێت و بەو شێوەیە خوێنی کۆرپە دەبێتە (Rh +) لەو کاتەدا ئەگەری کەم عەقڵی رووەدەدات.

**٢- هۆکارەکانی لە کاتی لەدایکبوون:**

هەندێکجار وا دەبێت، ئەو کاتەی منداڵ لە دایك دەبێت تووشی کەم عەقڵی دەبێت، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە منداڵ بەزەحمەت لە دایکی جیا دەبێتەوە، یاخود بە وشکی لە دایکی جیا دەبێتەوە کە ئەمانەش دەبێتە هۆی تێکچوونی بەشێکی کەم لە مێشکی منداڵدا. ئەو شێوە لەدایکبوونە وا دەکات ($O_2$) نەگات بە منداڵ با بۆ ماوەیەکی کەمیش بێت، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی (یانت) رێژەی ئەو منداڵانەی لە کاتی لەدایکبوون تووشی کەم عەقڵی دەبن بە لە ٣٪ دەخەملێنرێ.

**٣- هۆکاری پاش لەدایکبوون:**

ئەو هۆکارە رووداوە ناخۆشەکان دەگرێتەوە کە منداڵ لە زووەوە تووشی هەوکردنی کۆئەندامی مێشك یاخود هەوکردنی مۆخ و سورێژە، رێژەی تووشبوونی ئەو کەسانەی لە ٦٪ بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی (یانت).

## کاریگەری ژینگە لەسەر کەم عەقڵی:

زۆر لە لێکۆڵینەوەکان گرنگی تایبەتی بە هۆکاری ژینگە دەدەن کە چ کاریگەرییەکی لەسەر کەم عەقڵی هەیە. کۆمەڵێك لە پسپۆران سەلماندوویانە کە هەندێك لە کەم عەقڵی بۆ هۆکاری ژینگە دەگەڕێتەوە و ناویان ناوە (بێبەشبوون لە رۆشنبیری)، بەڵام هەندێکی تر بڕوایان وایە هەرچەندە مرۆڤ تووشی بێبەشبوونی رۆشنبیری بێت، ئەگەر بەهێزیش بێت

نابێته هۆی کەم عەقڵی وەکو ئەو لێکۆڵینەوەیەی زانا (دۆل) ئەنجامی دا، چونکە (دۆل) لای وایە کەم عەقڵی چاك نابێتەوە، چونکە لە ئەنجامی تێکچوونی مێشك روودەدات، دیارە هیچ جۆرە پەیوەندییەکیش لەنێوان رۆشنبیری و تێکچوونی شانەی مێشکدا نییە، بەڵام لە هەمان کاتدا گەلێك لێکۆڵینەوەش هەن دەسەلمێنن کە هۆکاری ژینگە هۆکاری خۆی هەیە لەسەر ئەو جۆرە منداڵانە، وەکو لێکۆڵینەوەکەی تریمان، سکنەر، شمیت، زانا سکنەر لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر دوو کۆمەڵە منداڵ کرد لە شوێنێکی تایبەت کە تەمەنیان لە سێ کەمتر بوو، کۆمەڵەی یەکەمی لەژێر چاودێری دانا، کۆمەڵەی دووەمی وەکو خۆی بەجێهێشت، کۆمەڵەی یەکەم ژمارەیان (١٣) منداڵ بوو، کە رێژەی زیرەکییان لەنێوان (٣٥ — ٨٩) پلەدا بوو، تێکڕای زیرەکییان (٦٤) بوو، سکنەر ئەو کۆمەڵە منداڵەی بردە دامەزراوێکی تایبەتی بۆ چاودێری کردنی کەم عەقڵەکان بۆ ماوەی ساڵێك و نیو، بەڵام کۆمەڵەی دووەم وەکو خۆی مانەوە کە ژمارەیان (١٢) منداڵ بوو کە رێژەی زیرەکییان لەنێوان (٥٠ — ١٣٠) پلەدا بوو، تیکڕای زیرەکییان ٨٧,٦ پلە بوو سکنەر ئەو منداڵانەی بەجێهێشت بۆ ماوەی ساڵێك و نیو، پاشان سەیری رێژەی زیرەکی کۆمەڵەی یەکەم لەژێر چاودێری تایبەت بوون، زیادی کردبوو بەرێژەی ٢٧,٢، بەڵام کۆمەڵەی دووەم رێژەی زیرەکییان کەمی کردبوو بە تێکڕای ٢٧,٢.

ئەو لێکۆڵینەوەیە ئەوە دەردەخا کە منداڵ ئەگەر بێبەش نەبێت لە رۆشنبیری تێکڕای زیرەکی لە زیادبووندایە وە بە پێچەوانەوە ئەگەر بێبەش بێت لە رۆشنبیری، ئەوا رێژەی زیرەکی کەم دەکات و دیارە ژینگە کاریگەری خۆی هەیە.

هەروەها لێکۆڵینەوەی شمیت کە لەسەر (٢٥٤) منداڵ ئەنجامی دا لە یەکێك لە قوتابخانەکانی شیکاگۆ تێبینی کرد رێژەی زیرەکییان لە ٥٢,١ زیادی کردووە بۆ (٧٦,٦) لە ماوەی سێ ساڵدا، پێش ئەوەی کارگوزاری چاکی بۆ رەخساندن، هەروەها ئەو رێژەیە لە زیادبووندا بوو هەتا گەیشتە (٨٩,٣) پاش تێپەڕبوونی پێنج ساڵ ئەم زیادەیە لە رێژەی زیرەکی یارمەتیدەرە بۆ چاککردنی رەفتاری کۆمەڵایەتی منداڵ و خۆگونجاندنیان لەگەڵ ژینگەدا.



## پۆلێنکردنی کەم عەقڵەکان:

کەم عەقڵەکان لەنێوان خۆیاندا جیاوازییان هەیە لە پلەی زیرەکی و لایەنەکانی تری ژیاندا، بەو رادەیەی وای لێهاتووە، زۆر گرانە کە ئێمە بتوانین کۆمەڵی لێکچوو دەستنیشان بکەین هەروەها جیاوازی لەو هۆکارانەی کە تووشی کەم عەقڵی کردوون، هەروەها ئەو منداڵە کەم عەقڵەی کە دەناڵێنێ بەدەستییەوە جیاوازە لەو منداڵە کەم عەقڵە بەهێزەی کە لەڕووی عەقڵی و هەڵچوون و کۆمەڵایەتییەوە هەیەتی، هەروەها ئەو منداڵەی بەهۆی بۆماوەیی تووشی بووە جیاوازە لەگەڵ ئەو منداڵە کەم عەقڵەی کە بەهۆی ژینگەوە تووشی بووە، لەبەر ئەوە پسپۆران جیاوازن لەڕووی پۆلینکردنی ئەم کەم عەقڵانە، بۆ نموونە پزیشکەکان لەسەر بنچینەی شوێنەواری هۆی تووشبوونەوە دابەش دەکەن، کۆمەڵێکی تر لەسەر بنچینەی توانای عەقڵی... هتد.

بۆ نموونە (ترید جولد) ئەو کەم عەقڵانەی لەسەر بنچینەی سەرچاوەی تووشبوون بەسەر (٧) کۆمەڵە دابەش کردووە:

١- **بێ هێزی عەقڵی بەرایی:** ئەمە نازانرێت هۆیەکانی تووشبوون چییە و ئەم کەسانەی لەم جۆرەن، ئاستی عەقڵی و زیرەکییان زۆر کەمە.

٢- **بێ هێزی عەقڵی لە ئەنجامی هەڵەیی گەشەکردن:** ئەم کۆمەڵەیە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە هۆی تووشبوونیان دەگەڕێتەوە بۆ هەڵەی جینات، وەکو پەشێوی ئەنزیمەکان و گلاندەکان، هەروەها گەشەی ئێسك لە کاتی بچووکی قەبارەی کەللە سەر، هەروەها زیادی لە ژمارەی کرۆمۆسۆمەکان وەکو مەنگۆلییەکان.

٣- **بێ هێزی عەقڵی لە ئەنجامی هۆکاری ژینگە:** ئەم کۆمەڵەیە ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە کۆرپە تووشی دەبێت لە کاتی لەدایکبوون، وەکو ئەوەی بەزەحمەت لە دایکی جیا دەبێتەوە، یاخود دایکی لە کاتی سکپڕیدا تووشی نەخۆشی دەبێت، یاخود هەندێکجار تووشی جۆرەها بێبەشبوون دەبێت وەکو کەمی گلاندی نوخامی، هەروەها بێبەشبوونی دەروونی.

ئەو زانا دەروونییانەی کە کەم عەقڵەکان دابەش دەکەن لەسەر بنچینەی پلەی زیرەکی زانا (لوتیت وکیرکن)

| کۆمەڵ | ڕێژەی زیرەکی |
|---|---|
| المورون | لە ٤٥ یان ٥٠ یان ٦٠ یان ٦٥ |
| ا پلە کەمتر | لە ١٥ — ٢٠ ، ٤٥ - ٥٠ |
| المعتوه | لە (٠) ١٥ یان ٢٠ |

دابەشکردنی کەم عەقڵەکان لەسەر ڕێژەی (لوتیت)

| کۆمەڵ | ڕێژەی زیرەکی |
|---|---|
| المورون | لە ٢٠ - ٧٥ |
| ا پلە کەمتر | لە ٢٥ - ٥٠ |
| المعتوه | لە ٠ - ٥٠ |

دابەشکردنی کەم عەقڵەکان لەسەر ڕێژەی کیرك

هەردوو دابەشکردنەکە بەسەر سێ کۆمەڵ دابەشکراون هەریەکێکیان ڕێژەی تایبەتی خۆی دراوەتێ و سنووری دیاریکراویان لە پلەی زیرەکی هەیە.

بەڵام هیبر دابەشکردنی ئەو جۆرە کەسانە لەژێر ڕۆشنایی گەیینی کۆمەڵایەتی داناوە بۆ ئاسانکردنی ڕاستی کەم عەقڵەکان و شێتیتی بە ڕێژەی زیرەکی و ڕەفتاری خۆگونجاندن بەستووە، وەکو ئەم ڕاستییە:

| ئاستەکان | ڕێژەی زیرەکی | ڕەفتاری خۆگونجاندن |
|---|---|---|
| ئاستی پێنجەم | ١,٠١ — ٢ | ١,٠١ — ٢,٢٥ |
| ئاستی چوارەم | ٢٠,١ — ٣ | ٢,٢٦ — ٣,٥٠ |



| | | |
|---|---|---|
| ئاستی سێیەم | ٣,٠١ — ٤ | ٣,٥١ — ٤,٧٥ |
| ئاستی دووەم | ٤,٠١ — ٥ | ٤,٧٦ - ----- |
| ئاستی یەکەم | ٥,٠١ - ------- | ----------- |

دابەشکردنی دوانی هیبر

## پۆلێنکردنی پەروەردەیی:

پسپۆرانی پەروەردەی تایبەت، کۆمەڵەی کەم عەقڵەکان بۆ سێ کۆمەڵە دابەش کردووە:

کۆمەڵەی یەکەم، توانای خوێندنیان هەیە.

کۆمەڵەی دووەم، توانای ڕاهێنانیان هەیە.

کۆمەڵەی سێیەم، ناتوانێت فێر بکرێن، نە ڕاهێنانیش کەڵکی هەیە بۆیان.

ئەو پۆلینکردنە پەروەردەییە پشت بە دابەشکردنەکەی (هیبر) دەبەستێت، تەنها ئەوەندە نەبێت ئاستی پێنجەم لە دابەشکردنەکەی (هیبر) لابراوە و ئاستی سێیەم و چوارەم کراوەتە یەك لەو خشتەیە:

| کۆمەڵ | ڕێژەی زیرەکی | ڕەفتاری خۆگونجاندن | توانای خوێندن |
|---|---|---|---|
| توانای خوێندنیان هەیە | ٢,٠١ — ٤ | ٢,٢٥ — ٣,٥٠ | هەتا پۆلی پێنجەم |
| توانای ڕاهێنانیان هەیە | ٤,٠١ — ٥ | ٣,٥١ — ٤,٧٥ | هەتا دووەمی سەرەتایی |
| دوورخستنەوە، چونکە توانای فێرکردن و ڕاهێنانیان نییە | ٥,٠١ — کەمتر | ٤,٦٧ — کەمتر | -------- |

**دابەشکردنی پەروەردەیی**

ئەو لێکۆڵینەوانەی لەو بوارەدا کراون ئەوە بەدیار دەخەن کە جیاوازی هەیە لەنێوان ئەو کەسانەی توانای فێرکردنیان لەگەڵ مرۆڤی ئاسایی لە ئاستی گەشەی لەشی و جوولەیی، بەشێوەیەکی گشتی باڵایان کورتترە و کێشیان کەمترە. هەروەها لە توانای جوولەیی سستترن لە ئاسایی، ئەگەرچی ئەو جیاوازییە هەستی پێ دەکرێ، دەتوانین بڵێین گەشەی لەشی و جوولەیی دەگاتە ئاستێکی زۆر نزیك لە مرۆڤی ئاسایی، بەڵام خاسیەتی هەڵچوون و کۆمەڵایەتی لەلای ئەو کەسانە زۆر جیاوازی هەیە لەنێوان خۆیان و لەگەڵ مرۆڤی ئاسایی، ئەو خاسیەتە کۆمەڵایەتییانە دەمێنێتەوە لەسەر تێڕوانینی کۆمەڵ، چونکە ئەوانە خۆیان کەم عەقڵن و خەڵکیش بۆ کات بەسەربردنی خۆیان گاڵتەیان پێدەکەن، زۆرجاریش ئەو گاڵتەپێکردنە دەبێتە هۆی هەڵچوون، هەروەها سیفەتەکانیان زیاتر دوژمنکارییە دووبارە و سێبارەی ڕەفتاریان دەکەنەوە و چالاکی زیادیان هەیە، ناتوانن دەست بەسەر هەڵچوونەکانیان دابگرن و دەتوانن پەیوەندی کۆمەڵایەتیی لەگەڵ خەڵکدا ببەستن، هەروەها مەیل و ئارەزوویان هەیە بەشداری لەگەڵ بچووکترین منداڵدا بکەن.

## کەم عەقڵە بەهرەمەندەکان:

هەندێکجار وا ڕوودەدات بەهرە و توانایەکی دیاریکراو لە منداڵێکی کەم عەقڵدا هەیە، ئەو بەهرە و توانایە دەگاتە پلەیەکی بەرز لە لایەنەکاندا کە لە پلەی سروشتی گەلێك بەرزترە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی زیرەکی ئەو کەسە زۆر نزمە و ئەو کەسانە پێیان دەگوترێ (بەهرەمەندە کەم عەقڵەکان). بۆ نموونە گوێی ئەو کەسە زۆر سووکە هەتا پلەی سەرسوورهێنەر یاخود چاوی زۆر تێژە یاخود توانایەکی بێ سنووری هەیە لە کرداری بیرکاریدا وەکو ئامێری ژمێریاری، یاخود خاوەنی توانایەکی گەورەیە لە شتی دەستی، یاخود توانای لەبەرکردنی ژمارەیەکی زۆری تەلەفۆناتی هەیە، یەکێك لە منداڵەکانی بەریتانیا کە تەمەنی (٩) ساڵ بوو، توانای لەبەرکردنی شوێن و کاتی شەمەندەفەرەکانی برایتونی هەبوو بۆ



ماوەی چوار ساڵی داهاتوو، ئەگەر کەسێکی ئاسایی هەوڵی ئەوە بدات کەی ئەو شەمەندەفەرانە دەگەنە شوێنی دیاریکراو بۆ ماوەی چوار ساڵ دەبێت چەند کردارێکی بیرکاری بکات، ئینجا دەزانێت.

هەروەها هونەرمەندی جیهانی (ڤان کوخ) هەمان گیروگرفتی هەبوو، گوایە گوێچکەی خۆی بڕیوە و بۆ خۆشەویستەکەی ناردووە، هەروەها نیچەی فەیلەسووفی جیهانی و گەلێکی تر.

زانایان لەو باوەڕەدان هۆی ئەو کەم عەقڵییە دەگەڕێتەوە بۆ لەناوچوونی کەمێك لە خانەکانی مێشك، بەڵام بەهرەمەندییەکە دەگەڕێتەوە بۆ کۆبوونەوەی بەشێکی زۆری زیرەکی لە شوێنێکی دیاریکراوی مێشك کە دەبێتە خاوەنی بەهرە.

## بەبیرهاتنەوە و لەبیرچوون (التذکر والنسیان)

بەبیرهاتنەوە بە مانا گشتییەکە بریتییە لە گەڕانەوەی ئەو شتانەی کە لەمەوپێش فێری بووینە و پارێزگاریمان لێ کردووە.

کاتێك ناوی یەکێك لە برادەرەکانت هاتەوە بیر مانای وایە لە کاتێکی پێش ئێستا ناوی ئەو کەسەت زانیوە، کەواتە گەڕانەوەی ئەو زانیارییە بریتییە لە ئامادەباشی پێشوەختە لە وێنەیەکی هزری یاخود جوولەیەك، بەڵام زانین بریتییە لە هەستی تاك کە لە کاتی ئێستا دەرکی پێدەکات لە شارەزایی ڕابردوو، یاخود بەشێوەیەکی تر بڵێین گەڕانەوەی شتی ڕابردوو بۆ بیری مرۆڤ شتێك نییە ئاشکرا و بەرچاو بێت بەرامبەر هەستەکانی مرۆڤ، بەڵام زانین بەبیرهاتنەوەی شتە و بەرامبەر هەستەکانی مرۆڤ.

لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا هۆی چییە ئێمە شتێکمان نایەتەوە بیر؟ یاخود بەئاسانی هەموو شتەکانمان نایەتەوە بیر، هەندێك جار پاش بیرکردنەوەیەکی زۆر ئینجا شتەکان دێتەوە بیرمان یاخود بەشێکی کەمی، هەروەکو ئەو قوتابییەی کە چەند دێڕێك لە هۆنراوەی لەبەر کردووە کاتێك دێتە قوتابخانە و لە تاقیکردنەوە هەموو نایەتەوە بیری یەکێك لە گیروگرفتە سەرەکییەکانی مرۆڤ کە بەدەستییەوە دەناڵێنێت،

لەبیرچوونەوەی ئەو زانیارییانەیە کە لە رابردوودا بەهۆی راهێنان و خوێندنەوە بەدەستی هێناوە، بەڵام لە کاتی پێویستدا نایەتەوە بیری.
یادەوەری بریتییە لە کرداری عەقڵی مرۆڤ کە لە رابردوودا بەچاو بینیویەتی و بە گوێ گوێی لێ بووە و دتوانێت لە کاتی پێویستدا بیهێنێتەوە یادی خۆی.
قوتابی کاتێك خۆی ئامادە دەکات بۆ تاقیکردنەوە یاخود ئەرکی ماڵەوە ئامادە دەکات کەچی لە کاتی تاقیکردنەوەدا یاخود لەناو پۆلدا نایەتەوە بیری، رەنگە زۆر لە قوتابییان ئەو پرسیارە بکەن و بلێن هۆی چییە کە شتمان نایەتەوە بیر؟
سایکۆلۆژیای خوێندنەوە بەشێکی گرنگە لە سایکۆلۆژیای پەروەردەیی، یان بە مانایەکی تر بلێین خوێندنەوە بە کرۆکی سایکۆلۆژیای پەروەردەیی دادەنرێت، کە ئەو بەشە هەوڵ دەدات لە دیاردەکانی گەشەی پەروەردە بکۆڵێتەوە، کە ئەو دیاردەیەش پشت بە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی دەبەستێت.
گیروگرفتی سەرەکی لە کرداری گەشەی پەروەردەیی ئەوەیە، چاکترین مەرج چییە کە قوتابخانە بیخاتە بەردەست قوتابییان بۆ ئەوەی ئامانجەکانی پەروەردەی لێ بێتەوە؟
سایکۆلۆژیای پەروەردە بەسەرچاوەیەکی سەرەکی دادەنرێت بۆ ئەو کەسانەی هەڵدەستن بەدانانی پرۆگرامی قوتابخانە و ئەو کەسانەی بەکاری جێبەجێکردن هەڵدەستن، چونکە ئەگەر هاتوو پرۆگرامێك دانرا لەگەڵ ئاستی قوتابییاندا نەبوو، ئەوا هەوڵەکە بەفیڕۆ دەڕوات، چونکە قوتابییەکە نەگەیشتۆتە ئەو ئاستە کە بتوانێت ئەو بابەتە هەزم بکات، هەروەها ئەو مامۆستایەی بەو کارە هەڵدەستێ دەبێت بەشێوەیەکی ئەوتۆ بابەتەکە بخاتە روو کە قوتابی بتوانێت لە یادەوەریدا بمێنێتەوە بۆ ماوەیەکی درێژ، دیارە ئەگەر هاتوو بابەتێك قوتابی بەچاوی خۆی ببینێ، زیاتر کاریگەری دەکاتە سەر یادەوەری قوتابی، بۆ نموونە ئامادەکردنی گازێك لە تاقیگەدا، ئەگەر هاتوو لەبەرچاوی قوتابی ئامادە کرا ئەوا زۆرتر لە یادەوەریدا دەمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو تەنها بەشێوەیەکی زارەکی گازەکە ئامادە بکرێت ماوەیەکی کورت لە یادەوەری دەمێننەوە و، پاشان لەبیری دەچێتەوە.



مرۆڤ لە دوو رێگاوە فێر دەبێت: یەکەمیان پێکهاتەی تایبەتی لەڕووی فسیۆلۆژییەوە و کاریگەری بۆماوەیی، دووەمیان کاریگەری ژینگە کە تێدا دەژی، هەریەکەشیان بەجیا کاریگەریی خۆیان هەیە لەسەر یادەوەری.
زانایان و پسپۆرانی فسیۆلۆژی لەو باوەڕدان کە گۆڕانی بەردەوام هەیە لەسەر یادەوەری کە ناسراوە بە (شوێنەواری یادەوەری) کە ئەوە لەسەر رووی موخی زیندەوەران هەیە، زۆربەی زانایان لەو باوەڕەدان کە یادەوەری دوورمەودا تۆمار دەکرێت لەسەر موخ بەرێگای گۆڕانی کیمیاوی لەسەر شاشەی دەماری دەردەچێت، ئەو گۆڕانە کیمیاوییەش بە دەوری خۆی هەڵدەستێ بە پەیوەندیکردن بە موخ، ئەو بەرپرسە لەو شتە هەردوو ماددەی (RNA, DNA) لەگەڵ هەندێك پرۆتین.
(DNA) ماددەیەکی کیمیاوییە کە زانیاری تۆمار دەکا لە خەسڵەتی بۆماوەیی هەموو کەسێك، هەروەها کارلێکەری دەکا لەگەڵ ناوکی شانە، هەروەها ماددەی (DNA) یارمەتیدەرە بۆ دەستنیشانکردنی پێکهاتەی (RNA) کە ئەوە ترشی کیمیاوی گەیەنەرە، زانیاری لە (DNA) بۆ هەموو بەشەکانی شانە دەگوازێتەوە و هەڵدەستێ بەرێکخستنی هەموو کردارەکانی شانە، جا ئەگەر یەکێك هەستێ بەبیرهێنانەوەی شتێك ئەو زنجیرە گۆڕانکارییە روودەدات هەر ئەوەشە وای لە زانایان کردووە کە (RNA) و پرۆتین گاریگەری خۆی هەیە لەسەر یادەوەری دوورمەودا.
هۆکاری دووەم کە پەیوەندی بە یادەوەری هەبێت هۆکاری ژینگەیە کە کۆمەڵێك هۆ هەن دەبنە یارمەتیدەر بۆ قوتابی بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی بابەتی خوێندنی بەبیربێتەوە لە کاتی پێویستدا.
زۆرجار وا دەبێت قوتابی خەریکی خوێندنەوەیە، لەهەمان کاتیشدا گوێ لە رادیو یاخود تەماشای تەلەفزیون دەکات یاخود لەناو کۆمەڵە کەسێك دانیشتووە گوێی داوەتە قسان، قوتابی لەو بارەدا ناتوانێت بەشێوەیەکی قووڵ مامەڵە لەگەڵ خوێندنەوە بکات، زانیارییەکان ناچێتە یادەوەری دوورمەودا تاکو لە هزر و بیری قوتابیدا بمێنێتەوە چونکە بە قووڵی نەچۆتە شوێنی مەبەست، سەیر دەکەین لە کاتی پێویست زانیارییەکان نایەتەوە بیری.

ئەوەی یارمەتی قوتابی دەدات کە زانیاری بە ئاسانی بچێتە یادەوەری تاکـە بـۆ ماوەیـەکی درێژ لە یادی نەچێتەوە ئەویش ڕێکخستنی شتەکانە کە قوتابی هەوڵی لەبـەرکردنی دەدات. دەروونزان (جوردن بور) هەستا بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر چەند قوتابییەك، جوردن بـور چـەند وشەیەکی تێکەڵاوی دا بە قوتابییەکان، پاشان هەمان وشەکانی دا بە کۆمـەڵێك قوتـابی تـر بەڵام بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ڕێکی خستبوو، هەردوو کۆمەڵە کاتیان وەکو یەك هەبوو، بـۆی دەرکەوت ئەو قوتابییانـەی کـە بـە شـێوەی ڕێکخستن وشـەکانیان لەبـەر کردبـوو توانـای بەبیرهێنانەوەیان هەبوو بەرێژەی ٦٤٪، بەڵام ئەوانەی بەشـێوەی تێکـەڵاو لەبـەریان کردبـوو توانـای بەبیرهاتنـەوەیان هـەبوو بەرێـژەی ١٧٪ وە ئـەو کەسـانەی هـەوڵ دەدەن بـەخۆیان گیروگرفتەکانیان چارەسەر بکەن باشتر شتیان بەبیر دێتەوە لەو کەسانەی بـۆ چارەسـەرکردنی گیروگرفتەکانیان پەنا دەبەنە بەر خەڵکی تر، پاشان پرسیارکردن ڕێگایەکە بۆ بەبیرهێنانـەوەی بابەت بە ڕێگای پرسیارکردن و وەڵامدانەوە کە قوتـابی لـە ڕێگـای پرسـیارە گرنگەکانـەوە هەوڵی ئەوە دەدات هەڵسوکەوتی قووڵ لەگەڵ بابەتـدا بکـات، جـۆری بابـەت بـۆ زانایـانی دەروونزانی روون بۆ ئەوە کە بابەتی ئاسان کە قوتابی فێری بووە لە هەمان کاتیـشدا قوتـابی بەئاسانی بەبیری دێتەوە، پیاچوونەوە بەهۆیـەکی گـرنگ دادەنرێـت لـە کـرداری یـادەوەری، چونکە قوتابی چەند بە وانەکانیدا بچێتەوە هێندە ئـەو زانیارییـە لـە یـادەوەری دوورمـەودا جێگیر دەبێت. بۆ نموونە گەر قوتابییەك بەردەوام خشتەی لێکدان بڵێتەوە ئەوەندە بە ئاسـانی دێتەوە یادی، بەڵام ئەگەر هاتوو بەکاری نەهێنێ واتـە ڕاهێنـانی لەسـەر نـەکات ئەمـە بـە زەحمەت دێتەوە یادی، پاڵنەریش هۆکارێکی ترە کە ئەوە هۆیەکی سەرەکییە بـۆ قوتـابی لـە کرداری یادەوەری، چونکە ئەگەر هاتوو قوتابی پاڵنەری نەبوو بۆ ئـەوەی هۆنراوەیـەك لەبـەر بکات یاخود نەیتوانی بەئاسانی لەبەری بکات، بەئاسـانیش لـە بـیری دەچـێتەوە گەرچـیش بەزەحمەت لەبەری کردووە بەڵام ئەگەر هاتوو پاڵنەری هەبوو بـۆ لەبـەرکردنی هاوکێـشەیەکی کیمیاوی ئەوا بە ئاسانی لەبەری دەکا و بۆ ماوەیەکی درێژیش لە یادی دەمێنێتەوە.

**زانایانی دەروونزانی بەسەر چوار کۆمەڵەدا دابەشیان کردوون:**

زوو شت لەبەر دەکەن لە یادیان دەچێتەوە، کە ئەم جۆرە لە هەموویان باشترە.

درەنگ شت لەبەر دەکەن و درەنگیش لە بیریان دەچێتەوە.



زوو شت لەبەر دەکەن و زووش لە بیریان دەچێتەوە.

درەنگ شت لەبەر دەکەن و زووش لە بیریان دەچێتەوە، کە ئەوەیان خراپترین جۆریانە.




هێلکاری (اتکسنون و شفرین بۆ یادەوەری) لە کتێبی مدخل علم النفس لندا دیفیدوف، ل٣٣٤.

## تیۆرییەکانی لەبیرچوونەوە

**١- تیۆری فەرامۆشکردن و وازهێنان:** ئەو زانیاری و شارەزاییەی مرۆڤ بەدەستی هێناوە لە رابردوودا، ئەگەر هاتوو بەردەوام نەبێت لەسەر مەشق و راهێنانیدا، یاخود بۆ ماوەیەکی زۆر تەرکی بکات و وازی لێ بهێنێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ئەوا ئەو زانیاری و شارەزاییە دەچێتە خانەی لەبیرچوونەوە، بۆ نموونە قوتابییەك لە سەردەمی منداڵیدا لەنێو ژینگەیەکی عەرەبیدا فێری زمانی عەرەبی بووە، پاشان دێتەوە نێو ژینگەی خۆی، زمانی عەرەبی بەکار ناهێنێت قسەی پێ ناکات، پاش ماوەیەك زمانی عەرەبی لەبیر دەچێتەوە ئەویش بەهۆی بەکار نەهێنانیەوە.

**٢- تیۆری چوونە ناو یەك تێکهەڵکێشکردن:** لێکۆڵینەوەکانی زانستی سەلماندوویانە منداڵ پێش نوستن کرداری لەبیرچوونەوەی لە سەرەخۆترە لەو کاتەی رۆژدا کە کاتی نوستنی نییە، هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە لە کاتی پێش نوستن هیچ شتێکی تر نییە تێکەڵاوی تێکهەڵکێشی ئەوەی پێش خۆی بێت، بەڵام لە کاتی رۆژدا کۆمەڵێك زانیاری تێکەڵاوی یەکتر دەبن، ئەو تێکەڵاوییە وا دەکات هەندێکیان لە بیری بچێتەوە، زانایان ئەوەشیان روون کردەوە کە ئەو کۆمەڵە زانیارییانە لە مێشکی مرۆڤ کۆ دەبێتەوە، کامە زانیاری یاخود کامە ئیش بەلای ئەو کەسەوە گرنگە ئەو ئیشە لەپێشەوەی جێبەجێکرنەوە دەبێت، یاخود ئەو ئیشە گرنگە لە یادی ناچێتەوە، بۆ نموونە قوتابییەك لە وانەیەك تاقیکردنەوەی هەیە لە وانەیەکی تردا وێنەیەکی ئەرکە و لە بابەتێکی تر چەند راهێنانێکی لەسەرە، لەبەرئەوەی تاقیکردنەوە زۆر گرنگە بەلای ئەو قوتابییە لە بیری ناچێتەوە، بەڵام دەکرێت ئەوانی تری لە یاد نەبێت، یاخود کەسێك دەچێتە بازاڕ بۆ کڕینی شتێك لە رێگادا بە تەلەفۆن ئاگادار دەکرێتەوە کەوا کەسێکی نزیکی لە نەخۆشخانە دایە، ناچار دەبێت لەبەر گرنگی نەخۆشخانە ئیشەکەی بازاڕی لە یاد دەچێت. هەندێك جار وا دەبێت قوتابی کۆمەڵێك ئەرکی ماڵەوەی دەدرێتی، ئەو قوتابییە پاش گەڕانەوەی لە قوتابخانە دەست دەکات بەجێبەجێکردنی ئەرکی ماڵەوە، وانەی یەکەم دەخوێنێت کە لەبەرکردنی هۆنراوەیەکی



زمان و ئەدەبی کوردییە، پاش لەبەرکردنی ئەو هۆنراوەیە راستەوخۆ دەست دەکات بەخوێندنی وانەی دووەم، ئەوەش هۆکارێکی ترە بۆ لەبیرچوونەوەی هۆنراوەی یەکەم بۆیە دەبێت قوتابی هۆشیار بێت کە وانەی یەکەمی خوێند ماوەیەك پشوو بدات و ناوبڕێك لەنێوانیاندا هەبێت، بەوەش دەگوترێت تێکەڵاوبوونی وانەی رابردوو لەگەڵ وانەی داهاتوو، تاقیکردنەوەکان سەلماندوویانە کە تێکەڵاوی لەنێوان دوو شتدا کاریگەری دەبێت لەسەر لەبیرچوونەوە، بۆ نموونە فێری مەلەوانی دەبێتە ئاستەنگ لەبەردەم فێربوونی یاری تۆپی پێ، هەروەها فێربوونی زمانی ئینگلیزی دەبێتە هۆی لەبیرچوونی زمانی عەرەبی گەر راستەخۆ بەدوایدا بێت.

دەروونزانەکان گەیشتوونەتە راستییەك کە هەرچەندە رادە و رێژەی بەیەکچوون زۆر بێت لەنێوان زمانەکاندا زۆرە بۆیە گەر دوو زمان لە دوای یەکەوە بێت گرفتی لەبیرچوونەوە زۆر دەبێت.

راستییەکی پەروەردەیی هەیە کە پێویستە مامۆستایان رەچاوی بکەن لە دانانی خشتەی وانەکاندا هەر کاتێك وانەی زمانی کوردییان هەبوو نابێت وانەی دووەم (زمانی عەرەبی)یان هەبێت چونکە رادەی وێکچوون لەنێوان هەردوو زماندا هەیە، بۆیە دەبێت وانەیەك دابنرێت کە دوور بێت لە زمان بۆ نموونە بیرکاری دابنرێت لە دوای وانەی بیرکاریش نابێت بەهەمان شێوە بابەتێك هەبێت لە بیرکارییەوە نزیك بێت... تاد.

**٣- تیۆری کپکردن:** لە لێکۆڵینەوەکانی پاڵنەری بێ هەستی بەدیار دەکەوێت کە لەبیرچوونەوەی و مێژووی رووداوەکان لە حەز و ئارەزووی کپ کراوە و سەرهەڵدەدات، هەروەها فرۆید دەربارەی ئەو لەبیرچوونەوەی ئەو بابەتانەی کە مرۆڤ حەزی لێ ناکات بەئاسانی دەچنە خانەی لەبیرچوونەوە و دیسان ئەو کەسانەی لە دڵەوە رقمان لێیانە ناوەکانیانمان زوو دەچێتەوە چونکە بەقووڵی مامەڵە لەگەڵ ناوەکانیان ناکەین.

تاقیکردنەوەکانی مەیدانی سەلماندوویانە ئەو کۆمەڵە کارەسات و رووداوانەی بەسەر مرۆڤدا دێت بەهەردوو جۆری ناخۆشی و خۆشی، مرۆڤ بەئاسانی دەتوانێت رووداوە

خۆشەکان بە ئاسانی بەبیر خۆیدا بهێنێتەوە، بەڵام کارەساتە ناخۆشەکان بەزەحمەت دێتەوە بیری. لە لێکۆڵینەوەیەکدا کە لەسەر (٥١) کەسدا ئەنجام درا و داوایان لێ کرا لە ماوەی سێ هەفتەی رابردوو هەرچی رووداوی خۆش و ناخۆشی هەیە باسی بکەن لە ئەنجامدا بەدیارکەوت بەرێژەی ٥١٪ رووداوە خۆشەکان تۆمار کرابوو لەبیریان مابۆوە، بەڵام بەرێژەی ٣١٪ رووداوە ناخۆشەکان بوو.

ئەو قسە و رووداوانەی مرۆڤ لەبیری دەچێتەوە مەرج نییە هەر هەموویان خراپ بن بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە بۆ ئەو کەسە بگەڕێتەوە، لە هەندێك باردا لەبیرچوون شتێکی باشە کە خوای گەورە بە مرۆڤی بەخشیوە، چونکە گەر بێتو بەدرێژایی تەمەنی ئەو کارەساتە دڵتەزێنانەی دیویەتی لەبیری نەچێتەوە مرۆڤ بەرگەی ئەو هەموو ناخۆشییە ناگرێت، بۆ نموونە کەسێك خۆشەویستکی دەمرێت سەرەتا گەلێك غەمگین دەبێت، جا ئەگەر بێتو ئەو غەمە لەگەڵیدا بمێنێت و لەبیری نەچێتەوە کارێکی قورس دەبێت لەسەری.

## ئەنجامەکانی تاقیکردنەوەکانی لەبیرچوونەوە

مرۆڤەکان هەموویان وەکو یەك نین لەڕووی توانستەکانی بەبیرهاتنەوە و لەبیرچوونەوە.

توانستەکانی جوولەیی بەزەحمەتتر لەبیر مرۆڤ دەچنەوە وەك شتەکانی زارەکی کە مرۆڤ لەبەریان دەکات.

ئەو بابەتانەی بە ماناوە لەبەر دەکرێن درەنگتر لەبیر دەچنەوە لەو بابەتانەی کە بێ مانا لەبەر دەکرێن.

لەبیرچوونەوە لە کاتی رۆژدا خێراترە نەك لە کاتی شەودا.

## تیۆرییەکانی فێربوون

سەدەی بیستی رابردوو سەدەیەکی پڕ لە داهێنان و بەخشش بوو لە بواری پەروەردە و فێرکردندا، کە کۆمەڵێك لە پەروەردەکاران و دەروونزانەکان توانییان گەلێك تیۆری لە



بواری فێرکردندا دابهێنن، ئەوەش وایکرد کە سەرجەم مرۆڤایەتی خۆیان بە قەرزاری ئەو پەروەردەکارانە و دەروونزانانەکان بزانن.

لەپێشدا پەروەردەکاران گرنگییەکی زۆریان بەفێرکردنی دەدا، بەڵام ئیمڕۆ هەموو ئاراستەکان بە ئاقارێکی تر دەڕۆن، لە رابردوودا گرنگی بە مامۆستا و رێگاکانی ئاسانکردنی کادیری مامۆستایەتی دەدرا، بەڵام ئیمڕۆ هەموو گرنگییەکانی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن چڕ کراوەتەوە بۆ قوتابی و یارمەتیدانی بۆ فێربوون، دیسان لە رابردوو پەروەردە خۆی یەکالا کردبۆوە بۆ یارمەتیدانی مامۆستا بۆ گواستنەوەی زانست و زانیاری لە هزر و بیرییەوە بۆ قوتابییان، جا ئەگەر هاتوو توانرا زانست و زانیارییەکان بگاتە مێشکی قوتابی ئەوە بەڵگەیە کە کاری فێربوون روویداوە، کەواتە دەتوانین بڵێین ئەو سەدەیە سەدەی قوتابییانە نەك مامۆستا، لە هەمان کاتیشدا مامۆستا سوورە لەسەر فێرکردنی قوتابییان ئەویش لە رێگای هاندان و پێشەوەبردنی، جا ئەگەر سەدەی نۆزدەم ئامادەکردنی منداڵ بێت بۆ ژیان لەسەر قسەی دەروونزانەکان و پەروەردەکارەکان ئەوە لەو سەدەیە فێربوون بۆتە هۆیەکی نموونەیی گرنگ بۆ منداڵ، چونکە فێربوون چالاکییەکی خودی مرۆڤە کە مرۆڤ هەوڵی هەموو وەڵامدانەوەکانی دەدات بۆ بەرەوڕووبوونەوەی گیروگرفتەکانی ژیان.

تیۆری لە زانستە سروشتییەکاندا یاخود لە زانستی زیندەگیدا بریتییە لە چوارچێوەی گشتی کە هەموو رووداوەکان بخرێتە ژێر یاسا ئەزموونییەکان، ئەوەش بە مەبەستی سنووردارکردنی ئەو پەیوەندییانەی کە هەندێکیان تێکەڵاوی هەندێکی تریان دەبێت، تاکو لە ئەنجامدا بە وێناکردنی کۆتاییان دێت.

لە دێرزەمانەوە مرۆڤ لە هەوڵی بەردەوامبووندا بووە بۆ دۆزینەوەی رێگای ئاسان بۆ فێربوون، کۆنترین هەوڵیش دەستی ئێمە کەوتبێ یاساکانی فەیلەسووفی یۆنانی ئەرەستۆیە.

ئەرەستۆ هەوڵی بەیەکبەستانەوەی مرۆڤ و ئەو ئیشانەی دەدا کە لە دەوروبەری روودەدات پاشان زانا (هوبز) جەختی لەسەر هۆکارێکی تر دەکرد ئەویش بەستانەوەی کات بۆ جیاکردنەوەی رووداوەکانی بەیەکچوون و جیاوازییەکان، چونکە

هوبز لای وابوو ئەگەر بەستانەوەی کات نەبێت ناتوانین شتە پێکچووەکان و جیاوازەکان لێك جیا بکەینەوە، یەکەمین لێکۆڵینەوەی فێرکردن بەشێوەی ئەزموونی زانا پافلوف Pavlov بوو کە لە ساڵی ١٨٤٩ لە ڤولگا لەدایکبووە، بۆتە مامۆستای ئەکادیمیای پزیشکی سەربازی و لە ساڵی ١٩٣٦ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی سوور لە موسکۆ نێژراوە.

پاڤلوڤ لە سەرەتاوە یەکێك بووە لە زانایەکانی بواری فسیۆلۆژی و خەڵاتی (نوبل)یشی لەسەر وەرگرتووە لە ساڵی ١٩٠٤ بەهۆی لێکۆڵینەوەکانی لەسەر کرداری هەرسکردندا پافلوف لەو لێکۆڵینەوەیدا هەستا بە پێوانەکردنی ئەو بڕە لیکەی سەگ فڕێی دەدا لە کاتی خواردنیدا، ئەو تیۆرییەی پاڤلوڤ ناونراوە بەستانەوە، واتە پەیوەندی نێوان ڕووژاندن و وەڵامدانەوە، پاڤلوڤ گەیشتە راستییەك لە لێکۆڵینەوەکانیدا هەموو وەڵامدانەوەیەك لە تاکدا دەبێت ڕووژاندنی هەبێت، جا ئەو ڕووژاندنە دەرەکی بێت یاخود ناوەکی، ئەو گۆڕانکارییە بەلای پاڤلوڤ فێربوونە، چونکە پاڤلوڤ تێبینی ئەوەشی کرد کە مرۆڤ توانای فەسلەجی بەهێزە و دەتوانێت بچووکترین ڕووژاندن وەڵام بداتەوە، جا ئەو ڕووژاندنە بەهێز بێت وەڵامدانەوەکەش بەهێز دەبێت بە هەمان بڕی ڕووژاندنەکە.

پاڤلوڤ تاقیکردنەوەکەی لەسەر سەگ ئەنجام دا، سەگێکی هێنا کە لە ئامادەباشیدا بوو لە ژوورێکی دانا ئەو ژوورە ڕووژاندنی دەرەکی لێ نەبوو، خواردنی بۆ سەگەکە هێنا، لەگەڵ هێنانی خواردنەکە زەنگی لێ دەدا، تاقیکردنەوەکەی چەند جارێك دووبارە کردەوە، سەگەکە قەناعەتێکی لەلا پەیدا بوو کەوا پەیوەندییەك هەیە لەنێوان هێنانی خواردن و زەنگ لێکدانەکە کەواتە بەستانەوەی خواردن بە زەنگ لێدان یاخود بەستانەوەی ڕووژاندن بە وەڵامدانەوە، تێبینی ئەوەش کرا کە خواردن دەدرێتە سەگەکە لیك فڕێی دەدات، هەموو ڕووژاندنێکی سروشتی دەبێتە وەڵامدانەوەی سروشتی وە هەموو ڕووژاندنی مەرجی دەبێتە وەڵامدانەوەی مەرجی.

ڕووژاندنی سروشتی (خواردن) ← وەڵامدانەوەی سروشتی لیك ڕژاندن.

ڕووژاندنی مەرجی (زەنگ لێدان) ← وەڵامدانەوەی مەرجی لیك ڕژاندن.



پاڤلوڤ دەڵێت بۆ هەر فێربوونێك دەبێت پاڵنەر هەبێت، ئەگینا فێربوونی ڕوونادات، بۆ نموونە منداڵێك حەزی لە پیشەی دارتاشییە کەچی باوکی سوورە لەسەر پیشەی ئاسنگەری، ئێستا گەورەترین کێشەی قوتابی کورد لەوەدایە دەچێتە کولیژێك کە حەزی لێ ناکات و پاڵنەری بۆی نییە، کاتێك لەو کولیژە دەردەچێت لە کارەکەی سەرکەوتوو نابێت، هەروەها مەرجی تری فێربوون لای پاڤلوڤ (گەیین)ە، ئاستی عەقڵی منداڵ دەبێت ڕەچاو بکرێت.

## یاساکانی فێربوونی مەرجی پاڤلوف:

١- **یاسای کوژانەوەی مەرجی:** بە یاسای یەکەمی پاڤلوڤ دادەنرێت ئەو یاسایە بریتییە لە سستی و لاوازی لەنێوان ئەو پەیوەندییەی هەیە لەنێوان ڕووژاندنی سروشتی و وەڵامدانەوەی سروشتی واتە هێنانی خواردن لەگەڵ زەنگ لێدان، لە تاقیکردنەوەی پاڤلوڤ بەدیارکەوت هەر کاتێك خواردن دەهات و لەگەڵ خواردنەکە زەنگی لێ دەدا، سەگەکە فێر بوو مانای زەنگ لێدان واتە هێنانی خواردن، بەڵام لە یاسای کوژانەوە کاتێك زەنگ لێ دەدرێت لە جاری یەکەمدا سەگەکە دیسان دەست بەلیك فڕێدان دەکات چونکە وا هەست دەکات خواردن دێت، بەڵام کە خواردنی بۆ نەهات چەند جارێك ئەو تاقیکردنەوە بکەین جار لە دوای جار سستی دەکەوێتە نێوان ڕووژاندن و وەڵامدانەوە هەتا وای لێ دێت ئەو پەیوەندییە نامێنێت.

پاڤلوڤ یاساکەی خۆی بەو شێوە دارِشت، هەر کاتێك ڕووژاندنی مەرجی بەدیارکەوت بەبێ پاڵپشتیکردنی ڕووژاندنی سروشتی لەو کاتەدا پەرچەکرداری مەرجی لاواز دەبێت.

٢- **یاسای پاڵپشتی لێکردن:** بریتییە لە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ڕووژاندنی سروشتی و ڕووژاندنی مەرجی، بە پێچەوانەی یاسای کوژانەوە، هەرچەند ماوەی نێوانیان کەم بێت ئەوا بەرێژەی زیاتر لیك دەرژێنێت چەندە ماوەکەش زۆر بێت لیك کەم دەبێت.

**٣- یاسای گشتاندن:** ئەو یاسایەی پاڤلوڤ دایڕشت، کە شت بە گشتاندن ئەگەیێنێت چونکە سەگەکە هەر کاتێك گوێی لە هەر زەنگێك دەبێت لیك فڕێ دەدات، بۆ نموونە کاتێك قازێك منداڵێك دەگەزێت منداڵەکە لە هەموو قازێك دەترسێت.

منداڵ + گازگرتن ←——— ئێش و ئازار و ترس.

بۆ نەهێشتنی ئەو ترسە لای منداڵ، منداڵەکە دەهێنین لە قازەکەی نزیك دەکەینەوە لە جاری یەکەم هەست بە ترسێکی زۆر دەکات وا هەست دەکات دیسان گازی لێ دەگرێت، چەند جارێك دووبارەی دەکەینەوە جار لە دوای جار ترس و هاوارەکەی کەمتر دەبێتەوە هەتا وای لێ دێت ترسەکەی جار لەدوای جار کەم دەبێتەوە تاکو هیچ ترسی نامێنێت و لەناو دەچێت.

ڕووژاندنەکانی پاڤلوڤ ڕەنگی دایەوە لەلای دەروونزانی ئەمریکی واتسن کە خاوەنی قوتابخانەی ڕەفتارییە، هەرچەندە واتسن خاوەنی هیچ تیۆرییەکی فێرکردن نییە، بەڵام ژمارەیەك تاقیکردنەوەی ئەنجام دا سەلماندی کە هێزی مەرجی پاڤلوڤ کاریگەری هەیە لەسەر ڕەفتاری مرۆڤ، واتسن تاقیکردنەوەیەکی لەسەر منداڵێك ئەنجام دا (البیرت)ی ناو بوو، ئەو منداڵە جەستەیەکی دروستی هەبوو هیچ ترسیشی نەبوو، واتسن هەندێك مشکی سپی هێنا و لەلای ئەلبیرتی دانا و یاری لەگەڵ دەکرد بێ ئەوەی لێیان بترسێ، لە پاشان واتسن لە پەنایەکەوە بەدزی سەیری منداڵەکە و مشکەکەی دەکرد کە یارییان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، بەڵام هەر کاتێك ئەلبیرت دەستی بۆ مشکەکان دەبرد، واتسن بە چەکوشێك لە پارچە ئاسنێکی دەکوتا و دەنگێکی بەرزی لێ پەیدا دەبوو، ئەو دەنگە ڕووژاندن بوو بۆ ترس پەیداکردن لای منداڵەکە، ئەوە وایکرد لە مشك بترسێت، نەك هەر ئەوەندەش بەڵکو هەر زیندەوەرێکی تر بە مشك دەچوو لێی دەترسا، ئەو تاقیکردنەوە یەك لەدوای یەکانە وای لە واتسن کرد ڕووژاندنێکی نوێ بۆ ترس زیاد بکات کە ڕووژاندنێکی دەستکردە بۆ پەیدابوونی ترس لە دەروونی ئەلبیرت.



واتسن سەرکەوتنێکی بەدەست هێنا لەو تاقیکردنەوەیەدا ئەویش ئەوەبوو کە دەتوانێت کۆنترۆڵی ڕەفتاری مرۆڤ بکەین.

٢- تیۆری دووەم هەوڵدان و هەڵەکردن، ئیدوارد ثورندایك لەساڵی ١٨٧٤ لە ئەمریکا لەدایکبووە و لە ساڵی ١٩٤٩ هەر لە ئەمریکا کۆچی دوایی کردووە، ثورندایك لە تاقیکردنەوەکانیدا گەیشتە ئەنجامێك لەسەر تیۆری فێرکردن، ئەوەش وایکرد بە باوکی دەروونزانی پەروەردەیی لە ئەمریکا بناسرێت.

یەکێك لە تاقیکردنەوە گرنگەکانی لەسەر پشیلە ئەنجام دا بۆ فێربوون، سندووقێکی هێنا دەرگایەکی تێدابوو بە قوولاییێك داخرابوو، پشیلەکەی برسی کرد و خستییە ناو سندووقەکەوە، لە دەرەوەی سندووقەکەش ماسییەکی دانا، لێرەدا ماسییەکە ڕووژاندن بوو، گەیشتنە ماسییەکە وەڵامدانەوە بوو، کاتێك پشیلەکە هەوڵی خۆ ڕزگارکردنی خۆی دەدا لەناو سندووقەکەدا بۆ ئەوەی بگاتە ماسییەکە ثورندایك ماوەی کاتەکەی گرتبۆوە، پشیلەکە پاش ماوەیەکی زۆر توانی خۆی لە قوولایی دەرگاکە بدات و دەرگاکە بکاتەوە و بگاتە ماسییەکە، پاش دووبارەکردنەوەی ئەو تاقیکردنەوەیە بۆ چەند جارێك بۆی دەرکەوت پشیلەکە جار لەدوای جار بە کاتی کەمتر دەتوانێت دەرگاکە بکاتەوە و بگاتە خواردنەکە، چونکە پشیلەکە جوولەی لەخۆوەی کەمتر دەبێت.

ثورندایك هەوڵی داوە تیۆرییەکەی خۆی لە قالبێکی فسیۆلۆژی دابڕێژێت، چونکە فێربوونی مرۆڤ ئاڤەڵی لەو کورت کردۆتەوە کە بەهێزکردنی پەیوەندی لەنێوان کۆئەندامی دەمار و دەمارە هەستییەکان لە کاریگەرە بە ڕووژاندن، هەروەها پەیوەندی نێوان دەماری جوولەیی کە دەبێتە وەڵامدانەوەی جوولەیی.

وەنەبێت تیۆرییەکەی ثورندایك بەرەوڕووی ڕەخنە نەبووبێتەوە، زانا (طولمان) لای وایە ئەو تاقیکردنەوەی ثورندایك تەنها بۆ ئاژەڵە نەك بۆ مرۆڤ، بەڵام ثورندایك سەرەتا خۆی ئەو پرسیارە دەکات و دەڵێت ئایا ئاژەڵ فێر دەبێت لە ڕێگای بیرکردنەوە و بەکارهێنانی عەقڵی! تاقیکردنەوەکان پیشان دەدەن ئاژەڵ توانای ئەوەیان نییە سوود

له شارەزایی ئاژەڵانی تر وەربگرن بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکان، بۆیە پەنا بۆ نارێکی دەبەن گەر تووشی تاقیکردنەوەی پێشوو بن، ثورندایك لە تاقیکردنەوەکەدا گەیشتە چەند ئامانجێك لەوانە ئاژەڵ لە ڕێگای تێبینیکردنەوە و بیرکردنەوە، بەڵکو لە ڕێگای نارێکی و شەپرێوی جوولەی کوێرانە.
فێربوونی هەوڵدان و هەڵەکردنی ثورندایك لەسەر مرۆڤەکانیش دەکرێت چونکە مرۆڤ فێری توانستەکانی جوولەیی دەبێت وەکو یاری تێنس لە ڕێگای بیرکردنەوە و تێگەیشتنەوە نییە بەڵکو لە ڕێگای وەڵامدانەوەکانی جوولەییەوە فێری دەبێت.

## یاساکانی فێربوون لای ثورندایك:

**١- یاسای شوێنەوار:** کورتەی ئەو یاسایە بریتییە لەوە تاك هەردەم هەوڵی دووبارەکردنەوەی ڕەفتارێك دەکات گەر هاتوو پاداشتی بەدواوە بێت، هەروەها لەو کارەش دوور دەکەوێتەوە کە سزای لەگەڵ دایە، هەموو وەڵامدانەوەیەکی سەرکەوتووش لە هەڵوێستێکی دیاریکراودا بەستراوەتەوە بە باری بەرزبوونی کەیفخۆشییەوە ئەوەش بە بەهێزکردنی پەیوەندی نێوان ڕووژاندن و وەڵامدانەوە، ئەوەش دەبێتە چەسپاندنی واتە سەرکەوتن و پاڵپشتی وەڵامدانەوە کاتێك پشیلەکە لە جاری یەکەمدا دەرگای سندووقەکەی کردەوە بووە مایەی دڵخۆشی، ئەو خۆشییە شوێنەوارێکی لەسەر گۆڕانی ڕەوشتی بەجێهێشت بۆیە لە جاری دووەم بەکەمتر توانی دەرگا بکاتەوە.
**٢- یاسای دووبارەکردنەوە:** ثورندایك لەو یاسایەدا وا دەبینێت کە دووبارەکردنەوە پەیوەندی نێوان دەمارەکان و ڕووژاندن و وەڵامدانەوە بەهێز دەکات، و هەروەها ڕووداوەکانی ڕەفتاری مرۆڤ ئاسان دەکات جێبەجێکردنی هەر کارێك لە جاری دووەمدا ئاسان دەبێت، و لە هەمان کاتیشدا هەڵەی کەمتر دەبێتەوە، بەڵام لە کاتی بەکارنەهێنان و فەرامۆشکردنی ئەو پەیوەندییە لاواز و بێ هێز دەبێت، بەڵام ئەو دووبارەکردنەوە ناتوانین تەفسیری فێرکردنی بۆ بکەین چونکە ئاژەڵ گەلێك جوولەی هەڵە دەکات زۆر زیاترە لە جوولە ڕاستەکانی.



**٣- یاسای ئامادەباشی:** تاك دەبێت ئامادەباشی هەبێت بۆ فێربوون، مەبەست لە ئامادەباشی، ئامادەباشی دەروونی و جەستەییە بۆ وەرگرتنی زانیاری.
ئەو یاسایە لێکدانەوە و تەفسیری یاسای شوێنەوار ثورندایك ڕوونی کردەوە لە مانای خۆشحاڵی و دڵتەنگییەوە ثورندایك سێ ئەگەری داناوە:
هەر کاتێك یەکەی گەیەنەر لە ئامادەباشیدا بوو بۆ وەرگرتنی ڕەفتار بوونەوەرەکە قەناعەت خواز و خۆش دەبێت.
هەر کاتێك یەکەی گەیەنەر لە ئامادەباشی دەبێت بۆ کارکردن، ئەو کارکردنە دەبێتە دڵتەنگی زیندەوەر.
ئەگەر هاتوو یەکەی گەیەنەر لە ئامادەباشیدا بوو بۆ کارکردن واتە گەیاندنی بۆ مێشك، لە هەمان کاتیشدا زۆری لێ بکەی بۆ فێربوون بێزاری لە تاك ڕوودەدات.

## سایکۆلۆژیای فێربوون

زانایانی دەروونزانی بەو شێوەیە پێناسەی فێربوونیان کردووە: (گۆڕان لە ڕەفتاری مرۆڤ، یاخود هەر گۆڕانێك بەسەر مرۆڤدا بێت لە جێبەجێکردنی هەر کارێك پێی دەگوترێت فێربوون) بەشێوەیەکی گشتی هەموو بوونەوەرێك چ مرۆڤ بێت یاخود ئاژەڵ لە ژیانی خۆیدا پێویستی بەفێربوون هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت کاروباری ڕۆژانەی خۆی ڕاپەڕێنێت، بەڵام هەندێك شت هەیە لە بوونەوەردا بە زگماکی فێری دەبن و هەندێکی تر بەشێوەی وەدەستهێنان و هەوڵدان، بۆ نموونە کاتێك منداڵ لە دایکی جیا دەبێتەوە کە تەمەنی لە دوو کاتژمێر تێپەڕی نەکردووە بەشێوەیەکی ڕەمەکی فێری مژینی مەمکی دایکی بووە یاخود مژینی مەمەی پلاستیکی، کە سەرچاوەی ژیانی تێدا مسۆگەر دەکات.
دەروونزانەکان گەیشتوونەتە ئەو ڕاستییە کە زۆربەی فێربوونی مرۆڤ لە ڕێگای وەدەستهێنان و هەوڵدانەوەیە لەو ژینگەی تێیدا دەژێت، کەچی ئاژەڵ بەشێوەیەکی گشتی لە ڕێگای ڕەمەکی (غەریزە) فێری شت دەبێت، وەکو باڵندە دەتوانێت باشترین و جوانترین هێلانە دروست بکات بێ ئەوەی کەس فێری کردبێت.

ئەوەی ئێمە مەبەستمانە فێربوونی قوتابییە لە قوتابخانە کە بە چ شێوەیەك قوتابخانە رۆڵی گرنگ و بەرچاو دەبینێت لە ئامادەکردنی تاك بۆ کۆمەڵگا، جا ئەو فێربوونە پرۆگرامی قوتابخانە بێت، یاخود فێرکردنی دابونەریتە کۆمەلآیەتییەکان، هەروەها رەنگدانەوەی ئەو فێربوونانە لە رەفتاری قوتابیدا، چونکە ئێستا ئامانجی سەرەکی فێربوون لەپاڵ پەروەردە و فێرکردن گرنگی دانە بە کەسیەتی قوتابی ئەو شتانەی کە لە قوتابخانە فێری دەبێت پێویستە لە رەفتاری رەنگ بداتەوە، بۆ نموونە قوتابییەك لە قۆناغی سەرەتایی لە وانەی زانستەکان فێری پاك و خاوێنی دەکرێت، سوودەکانی پاك و خاوێنی بۆ باس دەکەین، هیچ سوودێکی نابێت ئەگەر ئەو قوتابییە بە کردار جێبەجێ نەکات بۆیە ئێستا پەروەردەی نوێ چەخت لەسەر کردەوە دەکاتەوە.

پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بریتییە لە گەیاندنی زانست و زانیاری لە مێشکی مامۆستاوە بۆ مێشکی قوتابی، بەلآم بۆ ئەوەی بتوانین کرداری فێرکردن بە ئاسانی بگەینینە قوتابی دەبێت ئامادەباشی پێشوەختەی هەبێت بۆ ئەوەی پرۆسەی فێربوون بە ئاسانی ئەنجام بدرێت کە بەم شێوەیە:

١- **گەیین:** بەیەکەمین مەرج دادەنرێت بۆ فێربوون گەیین (نضج) بەو هەموو گۆڕانە ناوخۆیانە دەگوترێت کە لە بوونەوەر یاخود لە تاکدا روو دەدات و دەگەڕێتەوە بۆ پێکهاتەی فسیۆلۆژی بە تایبەتی کۆئەندامی مێشك، لێرەدا هۆکاری ژینگە رۆڵی تێدا نابینێت.

(ماك جۆش) دەڵێت: (پەیوەندی نێوان گەیین و فێربوون دەگەڕێتەوە بۆ گۆڕانی فێرکردن و تەمەن)، لێرەدا پێویستە جیاوازییەك لەنێوان گەیین و راهێنان بکەین، گەیین پەیوەندی بەگەشەکردنەوە هەیە، بەلآم راهێنان پەیوەندی بەفێرکردنەوە هەیە، کەواتە راهێنان و گەیین دوو شتی ئاوێتەی یەکترن.

زانایان (جیزل و تومسون) لە زانکۆی بیل لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەستان بە لێکۆڵینەوەیەك بۆ ئەوەی بزانن هەریەك لە راهێنان و گەیین چ کاریگەرییەکیان لەسەر فێربوون هەیە.



دوو منداڵی (جمك)ی یەك خانەییان هێنا کە هەموو سیفەتەکانیان وەکو یەك بوو، تەمەنیان (٤٦) هەفتە بوو، منداڵی (س) و (ص) هەستان بە تاقیکردنەوە لەسەر منداڵی یەکەم (س) بۆ ماوەی (٦) هەفتە و هەر رۆژەی (١٠) خولەك، راهێنانەکە بریتی بوو بەسەر پەیژە کەوتن تاکو تەمەنی گەیشتە (٥٢) هەفتە، ئەو منداڵە توانی بە ماوەی (٢٦) چرکە بەسەر پەیژەکە بکەوێت، بەلآم منداڵی (ص) کە هیچ راهێنانی پێ نەکرابوو، هەندێکیان پێدا کە تەمەنی بووە (٥٣) هەفتە توانی بە ماوەی (٤٥) چرکە بەسەر پەیژەکە بکەوێت، بەلآم پاش ئەو تەمەنە بۆ ماوەی دوو هەفتە راهێنان بە منداڵی (ص) کرد هەر رۆژەی (١٩) خولەك کە تەمەنی بووە (٥٥) هەفتە توانی بە ماوەی (١٠) چرکە بەسەر پەیژەکە بکەوێت، لێرەدا بۆمان بەدیار دەکەوێت پێشکەوتنی مندالی (ص) کە دوو هەفتە راهێنانی کرد بە پێش منداڵی (س) کەوتووە کە ئەنجامی گەیین بوو.

منداڵێکی تەمەن (٨) مانگە ناتوانێت بڕوات بەڕێوە، گەر لای پزیشك پشکنینی بۆ ئەنجام بدەین هیچ کەموکوڕیی نییە، بەلآم چونکە ئەندامەکانی نەگەییە و ناتوانێت بڕوا، بەلآم گەر هاتوو تەمەنی گەیشتە (١٥) مانگی دەتوانێت بە ئاسانی بڕوات، خۆ ئەگەر هاتوو لە تەمەنی (١١) مانگیدا راهێنان لەگەڵیدا بکرێت ئەوا بەهۆی راهێنانەوە زووتر پێ دەگرێت.

ئێستا لە جیهانی پێشکەوتوو دوو ئاراستە هەیە یەکێکیان لە ئەمریکا دەڵێن ئیمڕۆ ئێمە هەنگاوێکی چاکمان بڕیوە لە پێشکەوتن و میکانیزم و تەکنیکی پێشکەوتوومان هەیە دەتوانین منداڵ پێش ئەوەی بگاتە رادەی گەیین رەوانەی قوتابخانەیان دەکەین واتە دتوانین منداڵ پێش تەمەنی (٦)ساڵی رەوانەی قوتابخانەیان بکەین، ئاراستەی دووەم لە ئەورووپاوەیە بەتایبەتی ولآتی فەڕەنسا پشتگیری لێ دەکات دەڵێن: پێویست بەوە ناکات پەلە لە منداڵ بکەین با میکانیزم و تەکنیك هەبێت تاکو منداڵ بەشێوەی گەییینی سروشتی خۆی پێ بگات ئینجا رەوانەی قوتابخانەی دەکەین.

## جۆرەکانی گەیین:

**١- گەیینی ئەندامەکانی لەش:** مەبەست لە گەیینی ئەندامەکانی لەش گەشەکردنی لەشی مرۆڤە، کە هەر یەکێك لە ئەندامەکانی لەشی بەستراوەتەوە بە ئەرك و فەرمانێك، هەروەکو ئاشکرایە منداڵ ناتوانێت کەمترین سەرکەوتن بەدەست بهێنێت گەر هاتوو پێکهاتەی لەشی گەشەی نەکردبێت، کەواتە گەیینی لەشی مەرجی بنچینەیە بۆ فێربوون، بۆ نموونە قوتابی کە دەچێتە قوتابخانە پێویستە پەنجەکانی گەیی بووبن بۆ ئەوەی بەلای کەم بتوانێت قەڵەم و تەباشیر بەدەستەوە بگرێت و بتوانێت پێیان بنووسێت.

**٢- گەیینی عەقڵی:** مەبەست لە گەیینی عەقڵی پلەی گەشەکردنی گشتییە لە فەرمانەکانی عەقڵی کە پەیوەستە بە فێربوونی منداڵەوە، بۆیە دەبێت سنوور بۆ کاری فێربوون دابنرێت، بۆ نموونە لە زۆربەی سیستەمەکانی جیهانی تەمەنی (٦) ساڵی دەستنیشان کراوە بۆ ئەوەی منداڵ بچێتە قوتابخانە، تەنانەت ئەو منداڵانەی کە بەهرەمەندیشن چونکە گەیینی لەشیان کەموکوڕی تێدایە، کەچی لە لایەنی گەیینی عەقڵی پێشکەوتوون، بەڵام ئەو منداڵەی گەورەتر لە تەمەنەکەی دەخرێتە قوتابخانەی تایبەت کە پێی دەگوترێت (پەروەردەی تایبەت).

**٣- پاڵنەر:** بریتییە لەو وزە تەواوەی کە مرۆڤ لە جیهانی دەرەکی وەریدەگرێت، ئەو وزەیەی وێنەی ئامانجەکانی قوتابی دەکێشێت، کەواتە بەبێ بوونی پاڵنەر کرداری فێربوون روونادات، یاخود بەمانایەکی تر بڵێین پاڵنەر کرداری فێربوون ئاسان دەکات، بۆ نموونە قوتابییەك پاڵنەرێکی بەهێزی هەیە بۆ ئەوەی بتوانێت پلەی یەکەم بەدەست بێنێ، ئەو پاڵنەرە وا لە قوتابی دەکات کە هەوڵ و کۆششێکی زۆر بکات بۆ ئەوەی بە پلەی یەکەم دەرچێت کەچی قوتابییەکی تر بە هیچ شێوەیەك پاڵنەری نییە، واتە هەوڵ و کۆشش ناکات و نایەوێت فێر بێت مامۆستاش چەند جار وانەکەی بۆ دووبارە دەکاتەوە بێ سوودە چونکە پاڵنەری نییە و نایەوێت فێر بێت.

ئیمڕۆ گەورەترین کێشەی قوتابییان نەبوونی پاڵنەرە، سەیر دەکەین قوتابی بۆ ماوەی ساڵێك هاتوچۆی قوتابخانە دەکات هیچ سوودێکی لێ نابینێت، چونکە ئەو



قوتابییە لە هزر و بیری خۆیدا وای داناوە سەری ساڵ بە چەند رۆژێك پێش تاقیکردنەوە مامۆستای تایبەتی پێ دەڵێنەوە ئەوەش دەبێتە قەرەبووی تەواوی ساڵێك، بەڵام چونکە لە سەرەتاوە ئەو قوتابییە پاڵنەری نەبووە مامۆستاش ناتوانێت قەرەبووی بکاتەوە، یاخود بڵێین هیچ کاتێك مامۆستا نابێتە جێگرەوەی پاڵنەر بۆ قوتابی، ئەوە نەبوونی پاڵنەرە وا دەکات بۆ ماوەی چەند ساڵێك لە پۆلێکدا بمێنتەوە، پاشان دەست لە خوێندن هەڵبگرێ و بەرەو کار و پیشەك بڕوات کە پاڵنەری بۆی هەیە.

**٤- راهێنان:** بە هۆکاری سێیەم دادەنرێت بۆ ئاسانکردنی فێربوون و مانەوەی ئەو فێربوونە بۆ ماوەیەکی درێژ لە یادەوەری دوور مەودا، هەر کاتێکیش قوتابی بیەوێت بە ئاسانی دێتەوە بیری لە لێکۆڵینەوەیەکدا دەرکەوتووە قوتابی چەند مەشق و راهێنان بکات هێندە زۆرتر و باشتر فێر دەبێت، وەکو ئێستا لە قۆناغی سەرەتایی پەیڕەو دەکرێت، کاتێك مامۆستا داوا لە قوتابی دەکات کە وانەکەی چەند جارێك بنووسێتەوە، لە کاتی دووبارە و سێ بارەی نووسینەوەی بابەتەکە قوتابی رادێت و هەڵە ناکات، یاخود لە کاتی خوێندنەوە، قوتابییان لە دوای مامۆستا وانەکە دەڵێنەوە کە ئەوە خۆی لەخۆیدا راهێنانی قوتابییە لەسەر فێربوون.

گەلێك جار وا دەبێت لە کاتی رێنووسدا قوتابی وشەیەك هەڵە دەکات مامۆستا داوای لێ دەکات هەڵەکە (٥) جار بنووسێتەوە لە لایەك وەکو سزادانێك لە لایەکی تریشەوە وەکو راهێنانێك کە جارێکی تر هەڵە نەکات.

کتێبی (ئەلف و بێی) پۆلی یەکەمی سەرەتایی کە مامۆستا (ئیبراهیم ئەمین باڵدار) دایناوە پەیڕەوی ئەو راهێنانەی کردووە هەر کاتێك پیتێك فێری قوتابی دەکات لە وانەی دوای ئەو دووبارەی دەکاتەوە بۆ ئەوەی قوتابی بەردەوام راهێنانی لەسەر بکات و لە یادی نەچێتەوە، چونکە یەکێك لە هۆیەکانی لەبیرچوونەوە (تیۆری کپ بوونە) کاتێ: مرۆڤ شتێك فێر بووە، بەڵام بۆ ماوەیەکی درێژ بەکاری ناهێنێت دەبێتە هۆی لەبیرچوونەوە بە پێچەوانەوە بەکارهێنانی دەبێتە مایەی چەسپاندن.

## جۆرەکانی فێربوون

فێربوونی مەبەستدار.

فێربوونی بێ مەبەست.

**شێوەی فێربوونی بە مەبەست** هەموو ئەو فێربوونانە دەگرێتەوە کە قوتابی مەبەستییەتی فێری بێت وەك ئەو قوتابییەی داوای لێ دەکرێت خشتەی لێکدان لەبەر بکات، قوتابیش هەوڵی لەبەرکردنی دەدات، چونکە لێپرسینەوەی لەسەرە بۆ رێژەی دەرچوون و تاقیکردنەوەی لێ ئەنجام دەدات، بەڵام **جۆری دووەم بێ مەبەستە** کە قوتابی هیچ مەبەستێکی نییە فێری بێت بێ ئەوەی مەبەستی بێت، بۆ نموونە یەکێك گوێی لە ئاوازی گۆرانییەك دەبێت چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە کاتێك دەزانێت فێری بووە و لەبەریشی کردووە بێ ئەوەی خواستی فێربوونی هەبووبێ.

## کاریگەری پاداشت و سزا لەسەر کەسایەتی منداڵ

مرۆڤ لەو رووەوە لەسەر ئەو زەوییە خوولقاوە هەمیشە و بەردەوام لە هەوڵ و کۆششدا بووە تاکو بتوانێت خۆی لەگەڵ ژینگەدا بگونجێنێت، لە هەمان کاتیشدا بەرەورووی ئەو گیروگرفتانە ببێتەوە کە دەبنە کۆسپ و لەمپەر لەبەردەمیدا تاکە هۆکاریش کە مرۆڤ دەتوانێت بەرەورووی ئاستەنگەکانی بەردەمی ببێتەوە پرۆسەی پەروەردە و فێرکردنە، دیارە پەروەردەش لە بنەڕەتدا ئامانجی ئەوەیە کە زانیاری و چەمك و کارامەیی فێری مرۆڤ بکات کەواتە بوونی پرۆسەی پەروەردە یەکێکە لەو پرۆسە سەختانەی کە هەر لە بوونی مرۆڤەوە تاکو کۆتایی ژیانی بەردەوامە، پەروەردەش فرەلایەنە هەموو لایەنەکانی عەقڵی و کەسێتی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و جەستەیی دەگرێتەوە، بەڵام لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئایا پرۆسەی پەروەردە لەکوێوە دەست پێ بکەین، دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان وەکو (خێزان، قوتابخانە، گەڕەك و کۆڵان، بنکەی لاوان، شوێنە ئاینییەکان،... هتد)



ڕۆڵی گرنگ و بەرچاو دەگێڕن لە پەروەردەکردنی منداڵ لە هەمان کاتیشدا هەر هەموویان تەواوکەری یەکترن.

سزادانی منداڵ یەکێکە لە گیروگرفتەکانی پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن بەدەستییەوە دەناڵێنن بەتایبەتی پەروەردەی کلاسیکی لایان وابوو لە رێگەی سزادانەوە ئامانجە پەروەردەییەکان دێتە دی، وەکو ئەو قسەیە زۆر باوبوو کاتێك منداڵیان رەوانەی خوێندن دەکرد و دەیانگوت (مامۆستا گۆشتەکەی بۆ تۆ و ئێسکەکەی بۆ ئێمە) کەواتە دەتوانین بڵێین دامەزراوە پەروەردەییەکان ببوونە شوێنی ئازار و ئەشکەنجەدانی قوتابی لەپاڵ خوێندنەکەیدا کە ئەوەش وای دەکرد قوتابی دەست لە خوێندنی هەڵبگرێ یاخود خۆی لە قوتابخانە بدزێتەوە لە ترسی سزادان.

زانایانی پەروەردە و دەروونزانی لە هەوڵ و کۆششی بەردەوامدان بۆ دۆزینەوەی ئەلتەرناتیڤێك لەجیاتی سزادان، چونکە گەیشتوونەتە ئەو راستییەی منداڵ کاتێك سزا دەدرێت (مەبەست لە سزا بە هەموو شێوەکانییەوە وەکو لێدان بەدەست و دار هەندێك جاریش منداڵ بە ئاگر داخ دەکرێت، هەروەها منداڵ بەسەرخۆ داشکاندنەوە و دەمکوتکردن لە کۆڕ و مەجلیسدا) منداڵ حەز بەتۆڵەکردنەوەی خۆی دەکات لەو کەسانەی لە خۆی بچووکترن و دەسەڵاتی بەسەریاندا دەشکێت هەروەها رەفتاری دوژمنکاری هەر لەزووەوە سەرهەڵدەدات کە گەورەش دەبێت مرۆڤێکی سایلکوپاتی لێ پەیدا دەبێت.

فرۆیدی دەروونزان دەڵێت: (تەمەنی پێنج ساڵەی یەکەمی منداڵ زۆر گرنگ و هەستیارە بۆ کەسایەتی داوارۆژی منداڵ) بۆیە دەبێت منداڵ لەو تەمەنەدا هەڵسوکەوتی ئەوتۆی لەگەڵدا بکرێت کە شایانی گەورەیی خۆی بێت بەشێوەیەکی گشتی پاداشتی منداڵ کاریگەری لە سزادانی هەروەکو هاندان و پشتگیریکردنی باشترە لە سەرزەنشتکردنی.

دەروونزان ثورندایك دەربارەی پاداشت و سزا یاسایەکی بەناوبانگی هەیە (یاسای کارتێکردن) جەخت لەسەر ئەوە دەکات کە هەموو کاتێك مرۆڤ مەیلی بۆ ئەو

لایەنە دەڕوات کە پاداشتی بکات لە هەمان کاتیشدا لەو لایەنەش دوور دەکەوێتەوە کە سزای تێدایە دەروونزان تولمان هەستا بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر کۆمەڵێك منداڵ، تولمان منداڵەکانی کرد بە سێ کۆمەڵە لە بابەتی ژمێرە و بیرکاری پێ دەگوتن، کۆمەڵەی یەکەم هیچ پەیوەندی بەسەریانەوە نەبوو نە پاداشتی دەکردن و نە سزای دەدان، کۆمەڵەی دووەم لە کاتی وانەدا گەلێك هانی دەدان لەسەر پێشکەوتن، کۆمەڵەی سێیەم سزای دەدان و قسەی پێ دەگوتن ئێوە تەمبەڵن گێلن لە ئەنجامدا بەدیارکەوت لە ماوەی کەمی یەکەمدا کۆمەڵەی یەکەم خراپ بوون لە چاو دوو کۆمەڵەکەی تردا، پاشان وردە وردە بەدیارکەوت ئەو کۆمەڵەی کە سزا دەدران ئاستیان لە نزمبووندا بوو لە چاو ئەو کۆمەڵەی کە پاداشت دەکران.

کۆکردنەوەی پاداشت و سزا لە یەك کاتدا گەلێك چاکتر لەوەی پاداشت یان سزا بە تەنها بێت، بەکارهێنانی سزا بۆ راستکردنەوەی رەفتاری نارێك هەتا خۆی راست دەکاتەوە، پاشان پاداشتی لەسەر وەردەگرێت لێرەدا سزادان ئازارێکی کاتییە لەپێناو چێژ وەرگرتنێکی بەردەوام. بۆ نموونە قوتابی لە کاتی رێنووسدا وشەیەك هەڵە دەکات مامۆستاکەی داوای لێ دەکات کە وشە هەڵەکە پێنج جار بنووسێتەوە ئەو پێنج جار نووسینەوەیە سزایە، بەڵام کاتییە لە هەمان کاتدا دەبێتە بەردەوام کە جارێکی تر هەڵە نەکاتەوە.

هەروەها ثورندایك ئەوەشی لەلا ئاشکرا بوو کە پاداشت چ چاکە یاخود خراپە پێویستە لەو کاتەدا کە رەفتارەکەی تێدا ئەنجام دەدرێت، ئەگینا کاریگەری لاواز دەبێت هەرچەندە ماوە لەنێوانیان واتە کارەکە و پاداشتەکە زۆر بێت کاریگەری بێهێز دەبێت، جا بۆ ئەوەی پاداشتەکە بەرهەمدار بێت دەبێت بەزووترین کات پاداشت بدرێتەوە. بۆ نموونە منداڵێك بەرداخێك دەشکێنێت دەبێت هەر ئەو کاتە راستەخۆ ئامۆژگاری بکرێت یاخود ئەگەر سزا درا نابێت بۆ بەیانی سزا بدرێت، چونکە منداڵەکە لە یادی چووە.



دەروونزان (ماکورد) لە لێکۆڵینەوەیەکدا بەدیاری خست کە ئەو منداڵانەی حەز لە ئاژاوە و شەرەنگێزی دەکەن هۆکارەکەی بۆ ژینگەی خێزان دەگەڕێتەوە کە تێدا پەروەردە بووە، ئەویش بەهۆی خراپی مامەڵەکردنی دەوروبەرەکەی یاخود بەهۆی جیاوازی لە پەروەردەکردندا، لە کۆمەڵگای ئێمە زۆرجار وا رێك دەکەوێت دایك و باوك بەهۆی کاری دەرەوەیان منداڵیان دەبەنە شوێنێکی تر بۆ ئاگا لێ بوونیان بەمەش منداڵ تووشی دوو جۆرە پەروەردە دەبێت هەریەکەیان بەرەو ئاراستەی جیای دەبات لە هەندێك خێزاندا مامەڵەی توند بەرامبەر منداڵ دەکرێت تەنانەت جاری وا هەیە منداڵ بە ئاگر داخ دەکرێت لەو کاتەشدا رکوکینە لە دڵی منداڵ دروست دەبێت، بەڵام چونکە لەو کاتەدا دەسەڵاتی نییە و ئەو رکوکینەیە کپ دەکات، لە ترسی دایك و باوکی، هەر کاتێکیش ترسی دایك و باوکی نەمێنێت هەڵدەستێت بە خاڵیکردنی ئەو هەڵچوونە (تفريغ الانفعالي) بەسەر ئەو کەسانەی کە دەسەڵاتی بەسەریاندا دەشکێت یاخود هەڵدەستێت بەشکاندنی کەلوپەلیماڵەوە بەدزی دایك و باوك بۆ ئەوەی هەندێك دەروونی ئارام بێت.

سزادان گەلێك جار دەبێتە پاڵنەر بۆ پێشەوەچوونی تاك لە کاری رۆژانەیدا، هەر شتێك بکەی دەبێت پاڵنەری هەبێت، هەتا ئەو پاڵنەرە بەسزاوەش بەسترابێتەوە، گەر سزادانەکەش مامناوەندی بێت وەکو تاقیکردنەوەکەی دەروونزان تۆلمان کە جۆرێك بوو لە پاداشت چونکە پەیوەندی بەسەرکەوتنی مرۆڤەوە بوو.

تاقیکردنەوەکەی تۆلمان کە ئەنجامی دا لەسەر دوو کۆمەڵە منداڵ کە ژمارەیان (٤٠) منداڵ بوو دابەشی کردن بەسەر دوو کۆمەڵە (٢٠) بە (٢٠) یەکەم و دووەم کە فێری کاری دەستی دەکردن هەرکاتێك یەکێك لە گرووپی یەکەم هەڵەی دەکرد سزایەکی سووکی دەدان، بەڵام گرووپی دووەم کە هەڵەیان دەکرد سزای نەدەدان ئەنجامی تاقیکردنەوەکە دەرچوو کە گرووپی یەکەم سزا دەدران ژمارەی هەڵەکردنیان تا دەهات کەم دەبوو تاکو گەیشتە نیوە، هەروەها بە کاتێکی کەمتریش فێر دەبوون بەرێژەی (٣٠٪) لە چاو گرووپی دووەم هەروەها ئەو گرووپە سوورتر بوون لەسەر

فێربوون، قوتابخانەکانی دەروونزانی ڕەتی سزادان دەکەنەوە کە زیان بە کەسایەتی منداڵ بگەیەنێ کە کاریگەری نێگەتیڤانە لەسەر پاشەڕۆژی منداڵ، بەڵام ئەوەی فەلسەفەی تاکە لەنێو کۆمەڵدا کە بیروبۆچوونیان جیایە لە یەکتری دەربارەی سزادانی منداڵ، هەندێك لایان وایە کە لە ڕێگای سزادانەوە منداڵ دەبێت چاوترسای بکرێت بۆ ئەوەی پەروەردەی ڕاست وەربگرێت، هەندێکی تر لە ڕێگای ئامۆژگاری ڕێنماییەوە پەروەردەی منداڵ دەکەن، کەواتە دوو بۆچوونی دژ بەیەك لەنێو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکانەوە هەیە لە سەرووی هەمووشیانەوە خێزان قوتابخانەیە.

ئیمڕۆ ئەرکی پەروەردەی نوێ گەلێك قورس و گرانە، چونکە ڕێبازی تازەی پەروەردە تەنها گرنگی بە پەروەردە نادات، بەڵکو گرنگی بەدروستکردنی کەسایەتی قوتابیش دەدات، قوتابخانە یەك لایەنە بڕیاری سزادانی قوتابی داوە، بەڵام کاتێك قوتابی دەگەڕێتەوە ماڵ و ناو خێزانەکەی سزای توند دەدرێت بەوەش قوتابی تووشی دووفاقی دەبێت لە پەروەردەکردندا، لە لایەکی دیکەوە کاتێك باوك یاخود دایك سزای منداڵ دەدات منداڵەکە وا هەست دەکات لە قوتابخانەش مامۆستا هەمان سزای دەدات بەگوێرەی تاقیکردنەوەکەی دەروونزان پاڤلوڤ کە بەناوبانگە بە یاسای گشتاندن (التعميم).

پاڤلوڤ لە تاقیکردنەوەیەکدا سەلماندی ئەو ڕووژاندنە دەرەکی بێت یاخود ناوەخۆ تێبینی ئەوەشی کرد کە پێکهاتەی فەسلەجی مرۆڤ توانای وەڵامدانەوەی بچووکترین ڕووژاندنی هەیە جۆر و ڕووژاندنەکەش ئاستی وەڵامدانەوە دیاری دەکات لە یاسای گشتاندن کاتێك قاز منداڵێك دەگەزێت تووشی ئازاری دەکات منداڵەکە لە هەموو قازێك دەترسێت وا هەست دەکات هەموو قازێك ئازاری دەدات، چونکە وەڵامدانەوەی منداڵەکە بۆ هەموو قازێکە، بوونی منداڵ و ڕووژاندنی سروشتییە، گازگرتنەکە ڕووژاندنی مەرجییە ئەو دوو ڕووژاندنە دەبێتە وەڵامدانەوەی سروشتی کە ئازاردانە.

منداڵ + گازگرتن = ئێش و ئازار



بەگوێرەی ئەو یاسایەی پاڤلوڤ کاتێك منداڵ لە ماڵ سزا دەدرێت لە لایەن دایك و باوکییەوە وا هەست دەکات لە قوتابخانەش سزا دەدرێت چونکە مامۆستا ئافرەت بێت یاخود پیاو بە دایك و باوکی دەشوبهێنێ.

هەموو دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان ڕۆڵیان هەیە لە پێگەیاندنی کۆمەڵایەتی منداڵ هەر لە خێزانەکەی بە پلەی یەکەم دێت هەتا قوتابخانە و گەڕەك و کۆڵان کەواتە هەموو ئەوانە دەبێت یەك ئاراستەیان هەبێت بۆ پەروەردەکردنی منداڵ نەك هەریەکەی بە ئاراستەی جیاواز، بۆ نموونە لە قوتابخانە بڕیار دراوە سزا نەمێنێت و قوتابی بەسەرخۆیدا نەشکێتەوە، بەڵام ئەو کارە یەك لایەنە چونکە دامودەزگاکانی تر پابەند نین پێوە، گەلێك جار وا دەبێت خێزان بەتوندترین شێوە لە منداڵەکەی دەدات و هەڵچوونەکەی لە ترسان کپ دەکات و هەڵی دەگرێت بۆ قوتابخانە و لەوێ هەڵیدەڕێژێ کاتێك بزانێت سزا لە قوتابخانە نییە کەواتە هەمئاهەنگی لەنێوان دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان زۆر گرنگە چونکە هەموویان ژینگەی منداڵن، لێرەدا نابێت ڕۆڵی ڕاگەیاندن لەبیر بکرێت بۆ پیشاندانی فلیمی پەروەردەیی و زیانەکانی سزادانی جەستەیی و دەروونی چونکە زیان بە کەسایەتی دەگەیێنێت.

## سایکۆلۆژیای جیاوازی تاك

جیاوازی تاکیەتی دیاردەیەکی گشتی و ڕوون و بەرچاوە لەنێو سەرجەم بوونەوەرەکاندا، بەڵام هەندێك جار وا دەبێت بەهۆی سەرنج نەدانی وردی خەڵکی هەندێك کەس وا هەست دەکات، کە هەندێك لە تاکەکاندا شێوەی وێکچوونیان هەیە لەنێو خۆیاندا.

جیاوازی تاکیەتی بەو جیاوازییانە دەگوترێت کە لەنێوان تاکەکاندا هەیە، لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا وەکو جیاوازی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، گەشەکردنەوە، هەڵچوون، ڕەفتاری، زانستی، زیرەکی.... تاد.

مرۆڤ لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا گرنگییەکی زۆری بەو جیاوازییە داوە کە لەنێو تاکەکانی کۆمەڵدا هەیە، فەیلەسووفی یۆنانی ئەفلاتوون لە کتێبی (کۆماری

ئەفلاتوون)دا بەئاشکرا دەستنیشانی ئەو جیاوازییەی کردووە کە هەر تاکێك بۆ کارێك دەشێت کە لەگەڵیدا بگونجێت هەروەها دەڵێت نابێت دوو کەس لە دایك بووبن و لە یەکیش بچن بەڵکو هەر تاکێك جیاوازی هەیە لە یەکێکی تر لە بەهرە سروشتییەکاندا، کاتێك یەکێك بۆ کارێك دەشێت، یەکێکی تر بۆ کارێکی تر، بۆ نموونە قوتابییەك لە بواری خوێندندا زیرەك و سەرکەوتووە، بەڵام قوتابییەکی تر بەپێچەوانەوە لە خوێندن سەرکەوتوو نییە بەڵام سەیر دەکەین لە بوارێکی تردا زۆر سەرکەوتووە.

لێکۆڵینەوەکان سەلماندوویانە کە هیچ تاکێك لە جیهاندا ڕێك ناکەوێت لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا لە ١٠٠٪ وەکو یەك بن، بەڵێ لە هەندێك خاسیەت و تایبەتمەندی کارکردن هەندێك تاك و کۆمەڵ سیفاتی هاوبەشیان هەیە وەکو کۆمەڵەی مامۆستایان لەڕووی کارکردنەوە وێك دەچن یاخود لەڕووی ڕەنگەوە خەڵکانی ناوچە گەرمەکان وەکو یەك ڕەشن، بەڵام ناکرێت لە بوارەکانی تریشدا یاخود لە ڕەفتار و هەڵسوکەوتیشیان وەکو یەك بن، دیسان لەڕووی هەڵچوونەوە هەندێك کەس هەیە درەنگ هەڵدەچن و تووڕە نابن کەچی کەسانی تر هەیە زوو هەڵدەچن، لەڕووی کۆمەڵایەتیشەوە هەندێك تاك لەناو کۆمەڵدا دەتوانێت بەخێرایی، خۆی لەگەڵ خەڵك و دەوروبەر بگونجێنێت و پەیوەندی کۆمەڵایەتی بەهێزە، بەڵام بەپێچەوانەوە کەسانی تر هەیە درەنگ خۆی دەگونجێنێت، هەردەم دوورە پەرێزە لە خەڵکی، ناتوانێت تێکەڵاوی خەڵکی بێت، تەنانەت ئەو جیاوازییانە منداڵی (جمك)یش دەگرێتەوە کە لە خانەیەکەوە دابەش بوونە، زۆرجار وا دەبێت لەڕووی ڕەنگ و ڕووخسارەوە زۆر لە یەکەوە نزیکن، بەڵام لە لایەنەکانی تر لە یەك جیاوازن، هەروەها جیاوازی تاك لە خودی تاکیش بەدیار دەکەوێت، وەکو ئەو کەسەی لە لایەنی بیرکاری زۆر لێهاتووە، بەڵام لە پەروەردەی هونەری لێهاتوو نییە، یاخود لە وەرزش زۆر بەهێزە، بەڵام لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە گۆشەگیرە، هەروەها لەڕووی کێش و باڵا و گەشەکردنەوە هەمدیسان ئەم جیاوازییە بەرچاو دەکەوێت، بۆ نموونە لە قۆناغەکانی گەشەکردنی مرۆڤ هەر قۆناغێك خێرایی لە قۆناغێکی تر جیاوازە قۆناغی سکپڕی بەخێراترین



قۆناغی گەشەکردن دادەنرێت پاشان کە لە دایکی جیا دەبێتەوە ئەو خێراییە کەم دەبێتەوە تاکو دەگاتە قۆناغی هەرزەکاری، دیسان دەست بەخێرایی گەشەکردن دەکاتەوە، هەروەها لە لێکۆڵینەوەکاندا هاتووە ئەو منداڵانەی دواکەوتوون لەڕووی عەقڵییەوە گەشەکردنی لەشی و دەروونییەوەش دواکەوتوون لە پاشان جیاوازی تاك بە ڕوون و ئاشکرا لە هەردوو ڕەگەزی مێیە و نێرە بەرچاو دەکەوێت، کە کوڕ لەڕووی جوولەییەوە بەهێزترە لە کچان، بەڵام کچان لەڕووی زمانەوە باشترن لە کوڕان دەتوانن زووتر زمان بگرن.

لە ماوەی مێژووی ڕابردووی مرۆڤایەتیدا زانایان و لێکۆڵەرەوان لە ئەنجامی توێژینەوەکانیاندا گەیشتوونەتە دوو ئاراستە، دەربارەی هۆکار و سەرهەڵدانی جیاوازی تاکیەتی، ئاراستەی یەکەم مرۆڤ بەرەو ئەو لایەنە دەبات کە هۆکاری ژینگە فاکتەری سەرەکییە بۆ ئەو جیاوازییە، چونکە ئەو کۆمەڵەیە کە دەڵێن ژینگە هۆکارە، لایان وایە کە مرۆڤەکان یەکسانن لە توانستەکان، بەڵام هەندێك لە تاکەکان هەلی ژیانیان بۆ ڕەخساوە و ژینگەی دروست و لەباریان هەیە ئەو جیاوازییە سەریهەڵداوە.

ئاراستەی دووەم لایان وایە ئەو جیاوازییە پەیدا دەبێت لە ئەنجامی هۆکارەکانی بایلۆژی و لەژێر ڕۆشنایی ئامادەباشی بۆماوەیی یاخود جینات و کرۆمۆسۆمات، پاشان کۆمەڵگا دەتوانێت سوود لەو توانا و بەهرەیە وەربگرێت کە تاك هەیەتی.

فەیلەسووفی یۆنانی ئەفلاتوون لە کۆمارەکەیدا بەهرە سروشتییەکان لەنێوان تاکەکاندا هەیە، بۆیە کۆمەڵگای بەسەر سێ چین دابەش کردووە ئەویش بەهۆی جیاوازی تاکییەوە، چینی یەکەم بریتییە لە فەیلەسووفەکان و دەسەڵاتدارەکان کە ئەوانەش جیا دەکرێنەوە بە بوونی هێزی عەقڵی، چینی دووەم پێکهاتووە لە سەرباز و سوپا بۆ پارێزگاری لە کۆمار، کە ئەمانەش بەهێز و بازوون لەڕووی جەستەییەوە و هەڵچوونیش بەسەریاندا زاڵە، چینی سێیەم بریتییە لە کرێکار و کۆیلەکان کە ئەوانەش ئیشوکاری دەستی ئەنجام دەدەن واتە بەرهەمهێنن.

لە ساڵی ١٧٩٦ زانایەکی گەردوونناسی هەستا بە لەسەرکار لادانی ماسکیلین Maskely کە بەڕێوەبەری تەلسکوبی گرینیش بوو، ئەویش بەهۆی دواکەوتنی یەك چرکە، پاشان زانای گەردوونناس بسل Bessel هەڵسا بە لێکۆڵینەوەیەك لەسەر ئەو جیاوازییە کە ناسراوە بە (هاوکێشەی کەسایەتی) ناوەڕۆکی ئەو لێکۆڵینەوەی بەدیار دەخات کە کەسەکان جیاوازییان هەیە لە خێرایی و کاتی گەڕانەوە (زمن الرجع Frist time Rraction) کاتی گەڕاوە بریتییە لەو کاتەی کە لەنێوان رووژاندن و وەڵامدانەوەدا هەیە بۆ نموونە کاتێك شوفێرێك لە ترافك لایت دەوەستێت هەر کاتێك گڵۆپی سەوز داگیرسا ئەوە رووژاندنە واتە دەست بەرۆیشتنکردن، هەر کاتێکیش ئۆتومبیلەکە جووڵاوە ئەوە وەڵامدانەوەیە/ جا لە نێوان هەڵگیرساندنی گڵۆپە سەوزەکە و رۆیشتن کاتێك هەیە، بەو کاتە دەوترێت (کاتی خایاندن) هەرچەندە ماوەکە کەم بێت مانای وایە وەڵامدانەوە بەهێزە، بە پێچەوانەشەوە چەند کاتەکە زۆر بێت مانای وایە وەڵامدانەوە بێ هێز و سستە، جا ئەو کاتە جیاوازە لە تاکێکەوە بۆ تاکێکی تر.

لێکۆڵەرەوەکان دەروونزانەکان لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدە هەستان بە پێوەری جیاوازی تاکیەتی زانای بایلۆژی ئینگلیزی فرانسیس گالتون Francis Galton (1822 – 1911)) گرنگی دا بە لێکۆڵینەوەی بۆماوەیی لەلای مرۆڤ، لە کاتی لێکۆڵینەوەکەیدا زۆر بە وردی سەرنجی دا خاڵە پێکچووکانی نێوان خوشك و برا و منداڵە مام دا و لە ساڵی ١٨٨٣ی زایینی تاقیگەیەکی دروست کرد و چەند تاقیکردنەوەیەکی رێکوپێکی لەسەر جیاوازی تاکیەتی ئەنجام دا هەر بۆیە ئەو زانایە بە پێشەنگ و دامەزرێنەری سایلکۆلۆژیای جیاوازی تاکیەتی دەناسرێت، پاش ئەو لێکۆڵینەوەی گالتون لەسەر جیاوازی تاکیەتی بەدیارکەوت کە ماسکلین بەڕێوەبەری تەلسکوب بوو لە کار لادرا بەهۆی دواکەوتنی یەك چرکە لەبەر کەمتەرخەمی کارەکەی نەبووە، بەڵکو ئەوە جیاوازی تاکیەتی بووە، بەڵام ئەو کات کەس هەستی پێ نەدەکرد و ئەو جیاوازییە نەدۆزرابۆوە.



جیاوازی تاکیەتی لە دەروونزانیدا بە مانای تێکڕایی جیاوازی یەکێك لەگەڵ کەسانی دەوروپشتەکەی بۆ نموونە تێکڕایی کێشی کۆمەڵێك لە منداڵ (٣٠) کیلۆگرامە، کەواتە هەر زیادە و کەمییەك هەبێت لەو تێکڕایە دەبێتە جیاوازی ئەو کەسە لە منداڵەکانی تردا هەروەها هەموو لایەنەکانی تری مرۆڤ بەو شێوە دەبێت وەکو لایەنی عەقڵی و بەهرە و لەشی و دەروونی... تاد، کەواتە جیاوازی تاك بریتییە لە لادانی تاك لە ناوەندی ژمارەیی لە سیفەتە جیاوازەکانی مرۆڤ.

دیاردەکانی جیاوازی تاکیەتی سێ دیاردەی سەرەکی دەگرێتەوە، دیاردەی یەکەم ئەو جیاوازە تاکییەیە کەسەکە لە خودی خۆیدا هەیە وەکو گۆڕانکاری لەشی و دەروونی لە قۆناغەکانی گەشەکردندا، هەروەها ئەو کەسە لە هەموو توانستەکاندا توانای وەکو یەك نییە بۆ نموونە لە بواری وەرزشدا زۆر لێهاتووە، بەڵام لە بواری هونەردا کەم توانایە، دیاردەی دووەم بریتییە لەو جیاوازییەی کە تاك ئەنجامی دەدات لە جێبەجێکردنی چالاکییەکانی رۆژانەیدا وەکو ئەو کەسە توانای قسەکردنی رەوانی هەیە لەناو کۆمەڵێك کەسدا و دەتوانێت گفتوگۆ بکات لەگەڵ کەسانی وەکو خۆی، یاخود کۆمەڵە کەسێك بەیەکەوە کار دەکەن، سەیر دەکەین توانستی کارکردنی یەکێکیان لەگەڵ ئەوانیتردا جیاوازە، دیاردەی سێیەم ئەو جیاوازییەیە لەنێوان کۆمەڵێك کەسدا، ئەویش بەهۆی ناوەندی ژمێرەیی کە تاکێك لەنێو ئەو کۆمەڵە کەسە بەدەستی دەهێنێت، لە تاقیکردنەوە مەرج نییە هەموو لە جاری یەکەمدا سەرکەوتوو بن، بەڵکو جیاوازی بەدی دەکرێت لە توانستەکانی لێخورینی ئۆتومبێل.

رەنگە لێردا پرسیارێك بێتە پێشەوە ئایا هۆکاری ئەو جیاوازییە چییە کە لەنێوان کەسەکاندا هەیە و، هەندێك جاریش ئەو جیاوازییە لە خودی تاکدا بەدیار دەکەوێت؟

زانایان و دەروونزانەکان هۆکارەکانی ئەو جیاوازییە دەگەڕێننەوە بۆ دوو هۆکاری سەرەکی:

هۆکاری بۆماوەیی.

هۆکاری ژینگە.

هەریەك لە ژینگە و بۆماوە كار و كاردانەوە لە كەسایەتی تاك دەكەن بەشێوەی وەڵامدانەوەی هەر رووژاندنێكی دەرەكی و ناوەكی، بەڵام دەروونزانەكان جیاوازییان هەیە لەنێو خۆیاندا كە كەمیان واتە ژینگە یاخود بۆماوە دەبێتە هۆكار و سەرهەڵدانی جیاوازی تاكیەتی لەنێوان تاكەكاندا، كۆمەڵەی دەروونزانانی یەكەم كە لایان وایە بۆماوە هۆكارە بۆ جیاوازی تاكیەتییە، ئەویش پشت بەستن بە چەند لێكۆڵینەوەیەك لەوانە ئەو لێكۆڵینەوەییەی زانا گالتون Galton ئەنجامی دا لە ساڵی ١٨٧٤ی زایینی سەلماندی كە رێژەی زیرەكی لەنێو هەندێك خێزانی ئینگلیزیدا هەیە ئەویش لە رێگای بۆماوەییەوەیە، هەروەها لێكۆڵینەوەیەكی تر كە هاوشێوەی ئەوەی پێشووە لە لایەن دەروونزانان (تیرمان و فریمان و هولزنجر) لە ساڵی ١٩٣٧ هەمان ئەنجامیان بەدەست هێنا، ئەو لێكۆڵینەوەیە ئەنجام درا لەسەر (١٩) جووت منداڵی جمكی هاوشێوە، وە (١٩) منداڵی جمكی شێوە جیاواز، لێكۆلێنەوەكە (٣) لایەنی گرتەوە یەكەمیان لایەنی لەشی و دووەمیان توانستەكانی زیرەكی و سێیەمیان لایەنی كەسایەتی، بۆیان بەدیاركەوت كە لایەنی بۆماوەیی بە ئاشكرا بەسەریانەوە دیار بوو لە لایەنی لەشی چونكە لایەنی گەشەكردنە لە لایەنی لەشییەوە بە ئاشكرا هەستی پێ دەكرا، لایەنی دووەم كەمێك كەمتر كە زیرەكی بوو، كە ئەو لایەنەش زیاتر بوو لە لایەنی كەسایەتی بەڵام لایەنی سێیەم كەسایەتی كەمتر هەستی پێ دەكرا. هەروەها لێكۆڵینەوەكانی (ایزیك و بریل) لە ساڵی ١٩٥١ دەربارەی توانستی عەقڵی سیماكانی كەسایەتی دەیگێڕنەوە بۆ كاریگەری بۆماوەیی.

هەروەها كۆمەڵێك لێكۆڵینەوەی تر لەسەر ئەو منداڵانە ئەنجام درا كە لە دامەزراوەكانی كۆمەڵایەتی (خانەی نەوجەوانان) پەروەردە دەكران، یەكێك لەو لێكۆڵینەوانە كە لەسەر (٩١٠) كەس جێبەجێ كرا كە تەمەنیان لە سەرووی ١٨ ساڵاندا بوو، كە دەژیان لە دەرەوەی ماڵی راستەقینەی خۆیان، ئەو لێكۆڵینەوەیە بە مەبەستی رادەی سەركەوتنیان لە ژیاندا بەدیاركەوت بەرێژەی ٧٧٪ سەركەوتوون، وە رێژەی ١٣٪ سەركەوتوو نەبوون، وە رێژەی ١٠٪ كەسانی شەڕەنگێز و لادەر



بوون، ئەو رێژەیەش هەروەكو ئەو رێژەیە لەسەر ئەو كەسانەی كە لە ماڵی خۆیان پەروەردە دەكران.

زانایانی بایلۆژی لایان وایە كە تایبەتمەندییەكانی بۆماوەیی جێگیر و نەگۆڕن بە هیچ جۆرێك توانای چاككردن و گۆڕانیان نییە، بەڵام دەروونزانانی رەفتاری لایان وایە هەندێك خاسیەتی بۆماوەیی قابیلی گۆڕانە وەكو ئامادەباشی هەندێك، وە هەندێك جۆری رەفتاری توانای چاككردنیان نییە.

گەلێك لێكۆڵینەوەش لایەنگیریی ژینگە دەكات كە هۆكارە بۆ جیاوازی تاكیەتی، ئەو لێكۆڵینەوەی زانا (جیزل و لورد) لێكۆڵینەوەیەكیان ئەنجام دا لەسەر ئەو منداڵانەی پێش چوونە قوتابخانە، لەنێو ئاستەكانی كۆمەڵایەتی و ئابووری و لەسەر توانستەكانی زمانەوانی بەدیاركەوت ئەو منداڵانەی لە ژینگەی كۆمەڵایەتی و ئابووری بەرز و دەوڵەمەندن چاكتر و باشتر قسە دەكەن لەو منداڵانەی كە هەژار و كەم دەرامەتن.

جیاوازی تاكیەتی لەنێوان منداڵانی شار و دێهات دەروونزان (شمبرج) لە ساڵی ١٩٢٩ لە لێكۆڵینەوەیەكدا ئەنجامی دا بۆی دەركەوت كە منداڵانی شار باشترن لە منداڵانی گوند لەڕووی وشە و زمانەوە، بەڵام ئەو جیاوازییە بە ئاشكرا بەدیار ناكەوێت لە تاقیكردنەوەكانی جگە لە زمان بۆ نموونە لە دروستكردنی یاری شەش پاڵو، هەروەها لە وێنەكردنی ئاژەڵان كە تایبەتن بە ژیانی گوندەكان.

بێبەشبوون لە رۆشنبیری وەكو دوور لە ژیانی خەڵكی و تێكەڵاوبوونیان وەكو خەڵكی دوورەكان گۆشەگیربوونیان وەكو ئەو منداڵەی (اڤیرون) كە لە ساڵی ١٧٩٩ لە یەكێك لە دارستانەكانی فەڕەنسا دۆزرایەوە، یاخود وەكو ئەو دوو منداڵە هیندییەی كە دۆزرانەوە لە نزیك شاری (میدنابور) هەروەها ئەو منداڵەی بەناوی كاسبار هوسیر لە بەندیخانە بوو بۆ ماوەی ١٧ ساڵ كە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤی نەدیبوو، ئەو هەموو بارانەی سەرەوە كە باسمان كرد توانای ئەوەیان نەبوو خۆیان لەگەڵ كۆمەڵگا بگونجێنن، كە سەرجەمیان شێواندنی ژینگە بوو نەك بۆماوەیی، پاشان بەكارهێنانی دەرمان و

خواردنەوەی مەی و جگەرەكێشان نەخۆشی ئەنیما كاریگەری خۆیان هەیە لەسەر دواكەوتنی عەقڵی كە ژینگە تێدا بەرپرسە.

## گەشەكردنی زمان

زمان بەهەردوو جۆری قسەكردن و هێماكردن هۆیەكی سەرەكییە بۆ گەیاندنی ئەو شتەی دەتەوێ بە بەرامبەرەكەتی رابگەیەنی، كەواتە زمان دەبێتە هۆكارێكی بەهێزیش بۆ وەدەستهێنانی مەعریفی لەلای منداڵ، یاخود دەتوانین بە واتایەكی دیكەش بڵێین هەر كاتێك منداڵ تەمەنی بەرەو پێشەوە دەڕوات و فێری قسەكردن دەبێت ئەوە بەڵگەیە لەسەر پەیدابوونی عەقڵی منداڵ، هەر ئەوەشە دەمانگەیەنێتە ئەو باوەڕە كە بڵێین پەیوەندییەكی ئەرێتی هەیە لەنێوان سەرەتای فێربوونی قسەكردن و گەشەكردنی عەقڵی.

زمان لە پێناسەیەكی دیكەدا هاتووە هۆیەكە بۆ گەیاندنی هەست و سۆز و بیروباوەڕ لە ڕێگای دەنگەوە لە دەم دەردەچێت، یاخود لە ڕێگای كۆمەڵێك هێماوە كە ئاماژە لە فەرمانی دڵ و دەروون دەكات بۆ شیكردنەوەی هەست و نەستی ناوەوەی مرۆڤ، بەڵام لە لایەنی كۆمەڵایەتییەوە تێگەیشتنە لەنێوان مرۆڤەكان، كەواتە لە ڕێگای زمانەوە تاكەكان لە یەكتری دەگەن.

هاواركردن و گریانی یەكەمی منداڵ لە كاتی لەدایكبووندا یەكەمین دیاردەی ژیانی منداڵە ئەو هاوار و گریانەش لە ئەنجامی پاڵنەری هەواوەیە، لە پاشان ئەندامەكانی دیكە كە پەیوەندییان هەیە بە قسەكردنەوە پێ دەگات گەشەی زمانی دەستپێدەكان لە لێكۆڵینەوەی دەروونزان (جیزل) بەدیاركەوتووە منداڵ پێش ئەوەی قسە بكات و زمان بگرێت دەست بە كغەكغ دەكات پاشان وردە وردە فێری هەندێك وشەی دایە و بابە دەبێت بەڵام زیاتریش ئەو وشانە دەردەبڕێت كە پەیوەندییان بە مەلاشووەوە هەیە واتە سەرووی زمانەوە ئینجا ئەو وشانەی بە لێو دەردەبردرێن، ئەوە پاش گەیینی ئەندامەكانی پەیوەندیدار لە قسەكردنەوە، بەڵام لە هەندێك لێكۆڵینەوەی دیكە منداڵ



پێش لەدایكبوون ئەندامەكانی گەییون و لە ئامادەباشیدان هەر كاتێك هاتە دونیاوە ئامادەباشی قسەكردنی هەیە.

دەروونزان (سایلو) لە لێكۆڵینەوەیەكیدا بەدیاری خستووە هەرچەند ئەندامەكانی پەیوەندیدار بە قسە چاكتر و زووتر پێ بگات هێندە منداڵ هەڵەی زمانی كەم دەبێت، بۆ پشتڕاستكردنەوەی ئەو لێكۆڵینەوەیە دەروونزان (سیخایدرمان)[١] بەدیاری خست كە گەییینی ئەندامەكانی وا دەكات ژمارەی وشەكانی زیاد بێت و ڕستەكانیشی درێژ بێت، كەواتە لەژێر ڕۆشنایی ئەو لێكۆڵینەوانەی پێشەوە كە باسی لێوە كرا بەدیار دەكەوێت گەشەكردنی زمان بەستراوەتەوە بە گەشەكردنی جەستەیی وەكو (ئامێرەكانی دەنگ و دەمارەكانی گەروو، لێو و زمان، هەرچەندە ئەو ئەندامانە بێ خەوش و سەلامەت بن هێندە یارمەتیدەرن بۆ زوو قسەكردن.

كە پێناسەی زمانمان كرد وەنەبێت بەتەنها قسەكردن هۆیەكە بۆ لەیەك حاڵیبوون بەڵكو گەلێك جاریش لە ڕێگای هێماكردن دەتوانین خواست و مەبەستەكانی خۆمان بەیەك بگەیەنین وەكو بەدەست جووڵاندن و بڕۆ هەڵتەكاندن و چاو چوقاندن و سەر جووڵاندن ... هتد، هەروەها ئەوانەی كەڕ و لاڵن هەموو قسەكردنیان لە ڕێگای هێماوەیە، پاشان منداڵ پێش ئەوەی فێری زمان بێت گریان و هاواركردنی قسەیە و دایك بەئاسانی دەتوانێت لێی حاڵی بێت، دەروونزان (جیزل) دەڵێت: (دایك یەكەم كەسە دەتوانێت لە گریانی منداڵ تێبگات، و هەر بەهۆی گریانەوە دەتوانێت تەفسیری گریانەكە بكات، گەلێك جاریش كە منداڵ دەگرییێت دەبینین دایك دەڵێت ئەو منداڵە برسییەتی یاخود خەوی دێت... هتد.

---

١- فؤاد السید الهي، الاسس النفسیة للنمو من الطفولة الى الشیخوخة.

## ئەو هۆكارانەی كار لە گەشەكردنی زمان دەكەن:

**١- ڕێژەی زیرەكی:** ڕێژەی زیرەكی منداڵ ڕاستەوخۆ پەیوەندییەكی بەهێز و پتەوەی هەیە لەگەڵ گەشەكردنی زمان، سەرجەم لێكۆڵینەوەكانی مەیدانی لە بواری دەروونزانی ئەنجام دراوە ئەوە دەسەلمێنن كە منداڵی زیرەك و بەهرەدار زووتر فێری قسەكردن دەبن لە منداڵانی هاوتەمەنی خۆیان، كە ڕێژەی زیرەكییان وەك ئەوانە نییە منداڵی زیرەك و بەهرەدار توانای هەیە لە تەمەنی یازدە مانگیدا قسە بكات لە كاتێكدا تێكڕای قسەكردن لەلای منداڵ لە تەمەنی پازدە مانگی دایە، وە لەلای منداڵی كەم عەقڵ دەگاتە سی و هەشت مانگ.

**٢- گەیین:** مەبەست لە گەیین ئەندامەكانی پەیوەندداره بە قسەكردن، منداڵ ئەو كاتە ئامادە دەبێت بۆ قسەكردن، هەر كاتێك ئەندامەكانی قسەكردنی گەیشتە رادەی گەیین، سایلو لە لێكۆڵینەوەیەكیدا گەیشتە ئەو ڕاستییە منداڵ لە سەرەتای تەمەنیدا هەڵەی دەبێت لە كاتی قسەكردندا، پاشان وردە وردە هەڵەكانی كەم دەبێتەوە، كاتێك وردە وردە ئەندامەكانی دەست بە گەیین دەكات هەریەك لە دەروونزانان ادمز، دیفز، كودانف دەربارەی گەشەكردنی زمان گەیشتنە چەند ڕاستییەك:

١- منداڵ لە سەرەتادا لەنێو قسەكردندا زیاتر ناو بەكار دەهێنێت، پاشان لەگەڵ تێپەڕبوونی تەمەنیدا كەمی دەكاتەوە.

٢- بەكارهێنانی كردار و سیفات زیاتر بەكار دەهێنێت لە كاتی تێپەڕبوونی تەمەنیدا، واتە بەرەو پێش چوونی تەمەنیدا.

٣- بەكارهێنانی ئامرازی پەیوەندی و ئامرازی بەستنەوە درەنگ بەكار دەهێنن، ئەگەر بێتو بەراوردی بكەین لەگەڵ بەشەكانی دیكەی قسەكردن[1].

**٤- باری تەندروستی منداڵ:** بەتایبەتی لە ساڵی یەكەمی تەمەنیدا، ئەگەر تووشی نەخۆشی بێت، ئەو نەخۆشییە دەبێتە كەمی چالاكی تێكەڵاوبوونی لەگەڵ خەڵكدا

١- دراسات في علم النفس/ دحام الكيال.



ئەوەش دەبێتە هۆی دواكەوتنی گەشەكردنی زمان، هەروەها سەلامەتی ئەندامەكانی پەیوەندیدار بە قسەكردن وەكو گوێ و لێو و گەروو و زمان و ددان و سییەكان، بۆ نموونە بەگوێ دەتوانێت قسەی بەرامبەر ببیستێ بەتەواوی هەروەها ئەویش دەتوانێت بەهەمان شێوە وشەكان بە تەواوی دەربڕێت وەكو ئەوەی گوێی لێ بووە، پاشان قسەكردن بەرهەمی هاوسەنگی پەیدا بكات، ئەگەر هاتوو كەموكورییەك هەبوو لەو ئەندامانە دەبێتە هۆی دواكەوتنی زمان.

**٥- ڕەگەزی منداڵ:** لێكۆڵینەوەكان دەریان خستووە كە كچان زووتر گەشەی زمانیان پێدەگات پێش ڕەگەزی كوڕ لە سامانی زمانەوانی واتە زۆری وشە و هەروەها درێژی ڕستەكان بەشێك لە زانایان هۆكارەكەی بۆ ئەوە دەگەڕێننەوە كە ئەندامەكانی پەیوەندیدار بە قسەكردن لای كچان زووتر پێدەگات، بەڵام لای هەندێكی دیكە بۆ پێكهاتەی سروشتی كۆمەڵایەتی و ئەو كردارانەی ئەنجامی دەدەن، بۆ نموونە ئەو كار و چالاكییانەی كوڕ ئەنجامی دەدات زیاتر پشت بە چالاكی جوولەیی دەبەستێت، بەڵام چالاكییەكانی كچ چڕ كراوەتەوە لەسەر چالاكی قسەكردن.

**٦- ریزبەندی منداڵ لە خێزانەكەی:** زۆری و كەمی ئەندامەكانی خێزان و ریزبەندی منداڵ لە خێزاندا زووتر گەشەی زمانی دەستپێدەكات و سامانی وشەی لەلا زیاد دەبێت ئەویش بەهۆی ئەوەی منداڵی یەكەم لەلایەن دایك و باوك و داپیرەو باپیرەوە گرنگی زۆری پێ دەدرێت و هەركەسە لە ڕاستی خۆیەوە قسەی لەگەڵ دەكات و ئەوەش یارمەتیدەرە بۆ گەشەكردنی زمان، بەڵام منداڵی دووەم ئەوانی دیكە بەقەد منداڵی یەكەم قسەی لەگەڵ ناكرێت بۆیە لە منداڵی یەكەم دواكەوتوترن لەڕووی گەشەكردنی زمانەوە.

٧- باری كۆمەڵایەتی خێزان: هەندێك لە لێكۆڵینەوەكان لەگەڵ ئەوەدان كە منداڵ بە خێزانە دەوڵەمەندەكان گەشەكردنی زمانیان دەستپێدەكات وەك لە منداڵە هەژارەكان، ئەویش بەهۆی ئەوەوەیە كە منداڵی دەوڵەمەند بەهۆی هۆیەكانی ڕاگەیاندنەوە وەكو (CD, TV)یەوە فێری قسەكردن دەبێت، بەڵام هەندێكی دیكە بە پێچەوانەوە لایان

وایە منداڵی گەڕەکە هەژارنشینەکان زووتر گەشەی زمانیان دەستپێدەکات، چونکە ئەو منداڵانە لە گەڕەك و کۆڵان تێکەڵاوی منداڵانی دیکە دەبن لە ئەنجامی تێکەڵاویبوونیان بەیەکتری زمانیان زووتر گەشە دەکات.
لێرەدا هەردوو بیروبۆچوون بۆ یەك سەرچاوە دەگەڕێتەوە کە تێکەڵاوبوونە و گوێ لە قسە بوونە، بەڵام هێندە هەیە منداڵ لە خێزانە دەوڵەمەندەکان زیاتر گوێی لە قسە دەبێت کەمتر وشە و رستە دەردەبڕێت، بەڵام لە هەژارنشینەکان هەم گوێی لێ دەبێت و هەمیش قسەکانی بە وشە و رستە دەردەبڕێت.

## قۆناغەکانی گەشەکردنی زمان:

منداڵ لە کاتی لەدایکبووندا هاوار و گریانی لێ بەرز دەبێتەوە، کە ئەوە سەرەتایەکە بۆ قسەکردنی منداڵ، لەلای دەروونزان (ارون) ئەو هاوارە بریتییە لە پیتە نەبزوێنەکان، بەڵام لەلای دەروونزان لیەبك ئەو دەنگەی یەکەمی منداڵ کە گوێمان لێی دەبێت هیچ مانای نییە[1].
لە مانگی سێیەمی تەمەنی منداڵ تاکو تەمەنی شەشەمین منداڵ دەست دەکات بە کغەکغ ئەوە بەرێژەی ٤٢٪ بەڵام بەرێژەی ٧٥٪ زیاتر ئەگەر تەمەنیان گەیشتە دوازدە هەفتە دەست بەو کارە دەکەن، بەڵام لەلای دەروونزان (شیرلی) لە پێنج مانگییەوە هەندێك دەنگیان لێ پەیدا دەبێت، پاش ئەو تەمەنە منداڵ کە گوێی لە قسەکردن دەبێت دەرك بە مانای وشەکان دەکات بەڵام ناتوانێت وشەکان دەرببڕێت، بۆیە منداڵ لەو تەمەنەدا وەڵامدانەوەی بۆ وشە و دەربڕینەکان هەیە، بۆ نموونە کاتێك دایك و باوك قسەی پێ دەڵێن ئەویش بە جووڵانەوە کار دەکات وەکو ئەوەی دایك و باوك پێی دەڵێن بای بای ئەو دەستەکانی دەجووڵێنێ، ئەوە بەردەوام دەبێت هەتا تەمەنی (١٠ — ١١) مانگی لەلای منداڵی بەهرەدار لەلای هەندێك لە زانایانی دەروونزانی دەستکردن بە قسە بەڵگەیە بۆ پەیداکردنی عەقڵی ئەو منداڵە.

١- دراسات في علم النفس/ دحام الكيال.



منداڵانی هەموو دونیا بەیەکەوە بەو قۆناغانەدا تێپەڕ دەبن، بەڵام رۆشنبیری و شارستانییەتی نەتەوەیەك لەگەڵ نەتەوەیەکی دیکە جیاوازە ئەویش بەهۆی گۆڕانی ژینگە لەگەڵ ژینگەیەکی دیکە، بۆ نموونە منداڵێك لە تەمەنی پێنج ساڵی لە ژینگەیەکی ئەڵمانی توانای فێربوونی ١٩٠٠ وشەی هەیە، بەڵام لەلای منداڵەکی فەرەنسی توانای ١٥٠٠ وشەی هەیە، کەچی لەلای منداڵێکی ئەمریکی لە هەمان تەمەندا توانای فێربوونی ٢٤٠٠ وشەی هەیە[1]

## پەیوەندی پەروەردە بە تەندروستی دەروونییەوە

پرۆسەی پەروەردە و فێرکردن وەکو روون و ئاشکرایە لای هەموومان ئامادەکردنی تاکە بۆ کۆمەڵ، هەر تاکێکیش لەنێو کۆمەڵگاکەیدا فێری خۆرەوشت و دابونەریت و بەها تایبەتییەکانی خۆی دەبێت، بۆ ئەوەی بتوانێت هەموو پێویستییەکانی رۆژانەی خۆی جێبەجێ بکات.
کرداری پەروەردە و فێرکردن بەشێوەیەکی بەردەوام لە ئالوگۆڕ دایە.
ژینگە ⇄ بوونەوەر
مرۆڤ لە سروشتی کۆمەڵایەتی خۆیەوە بەردەوام هەوڵ دەدات بۆ وەدەست هێنانی هاوسەنگییەك لەنێوان بەها و ئاراستەکردندا بۆ یارمەتیدانی و پتەوکردنی کەسایەتی، مەبەستی سەرەکیش لەو هاوسەنگییەدا گەشەکردنی باری هەڵچوونی کۆمەڵایەتییە.
تەندروستی دەروونی یارمەتیدەرێکی باشە بۆ هەموو ئەو کەسانەی لە بواری پەروەردەدا کار دەکەن بۆ تێگەیشتنی رەفتاری تاك لەلایەك و چارەسەرکردنی گیروگرفتی هەڵچوونی تاك لەلایەکی دیکەوە.
کەواتە پەروەردە و تەندروستی دەروونی شان بەشانی یەکتر دەڕۆن بۆ ئەوەی هەردووکیان بگەنە ئامانجەکانیان، ئەو ئامانجەی گەشەی تاکە و تەواوکەری کەسایەتی مرۆڤە.

١- علم النفس الطفولة والمراهقة/ حسين الالوسي واميمة علي خان.

پرۆسەی پەروەردە پێویستە لەسەر بنەمای ڕێز و خۆشەویستی بێت، لەنێوان قوتابییان و مامۆستایان، چونکە ڕۆژانە ئەو دوو توێژە بەرەوڕووی یەکتر دەبنەوە و کاتێکی زۆر لەگەڵ یەکدا بەسەر دەبەن، جا لە سەرەتاوە پێویستە مامۆستا پێشەنگی پرۆسەی پەروەردە بێت لەڕووی تەندروستی دەروونییەوە چاك و سەلامەت بێت.
پرۆسەی پەروەردە بریتییە لە گواستنەوەی زانست و زانیاری لە مێشکی مامۆستاوە بۆ مێشکی قوتابییان، ئەگەر ئەو کردارە رووی نەدا ئەوا کرداری فێربوونیش رووی نەداوە.
کاری مامۆستا بە تەنها لە گەیاندنی زانست و زانیاری چڕ نەکراوەتەوە، بەڵکە بۆ گەیاندنی ئەو پەیامە هۆکارەکانی پەروەردەییش رۆڵی گرنگ و بەرچاو دەگێڕن لە پرۆسەی فێرکردندا بە تایبەتی رەفتاری مامۆستا لە چوارچێوەی قوتابخانەدا، پێش هەموو شتێك مامۆستا دەبێت گیانی برایەتی لەنێوان خۆی و قوتابییەکاندا بچەسپێنێت، قوتابی هەست بکات مامۆستا وەکو هاورێیەکی دڵسۆزیەتی و ئامادەیە هەموو گیروگرفتەکانی چارەسەر دەکات، ئەگەر هاتوو بەو شێوەیە رەفتاری کرد، لەو کاتەدا مامۆستا دەبێتە جێگای بڕوا و متمانەی قوتابی، قوتابیش ئامادەیە هەموو نهێنییەکانی خۆی لەلا بدرکێنێ، بەڵام ئەگەر مامۆستا خۆی لە کێشە و گرفتەکانی قوتابی کێشایەوە، بۆ نموونە دەڵێت ئەوە گیروگرفتی خۆتە! ئەوە لەو بارەدا قوتابی هەست دەکات مامۆستا ئامادە نییە گوێ لە گیروگرفتەکانی بگرێت، بۆیە متمانە لەنێوانیاندا نامێنێت، هەروەها بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر قوتابی گەلێك کاردانەوەی نێگەتیڤانەی لێ دەکەوێتەوە، چونکە هەر کاتێك مامۆستا پەنای بۆ سزادانی برد ئەو قوتابییە هەردەم لە خەیالی ئەوە دایە کەی و چۆن سزا دەدرێت، ئاگاداری وانە نابێت، یاخود بە مانایەکی دیکە هەر بیری لای سزادانە، ئەوەش گەلێك جار دەبێتە هۆی دەست هەڵگرتنی قوتابی لە قوتابخانە.
دەروونزان (تولمەن) هەستا بە تاقیکردنەوەیەك لەسەر دوو کۆمەڵە قوتابی، کۆمەڵەی یەکەم توندوتیژی و سزایان لەگەڵ بەکار دەهات، کۆمەڵەی دووەم لە ڕێگای ڕێنمایی



پەروەردەیی کردنەوە هەڵسوکەتیان لەگەڵ بەکار دەهات، لە ئەنجامدا بۆی دەرکەوت کۆمەڵەی دووەم ئاستی فێربوونیان گەلێك بەرزترە لە کۆمەڵەی یەکەم، جگە لەوەش کۆمەڵەی دووەم دەتوانن زۆر بەئاسانی خۆیان لەگەڵ ژینگە بگونجێنن مامۆستا و قوتابخانەیان لەلا خۆشەویستە، بەڵام کۆمەڵەی یەکەم رقیان لە مامۆستا و قوتابخانەیە و رێژەی دەرچوونیشیان کەمترە بە بەراورد لەگەڵ کۆمەڵەی دووەم، هەروەها رێژەی ئامادە نەبوونیان لە پۆل و قوتابخانە و دەست هەڵگرتن لە خوێندنیش گەلێك زۆرترە.

## منداڵ و دزیکردن

دزیکردن واتە بردنی کەلوپەلی خەڵکی بەبێ ئاگایی خاوەنەکەی، دیارە دزیکردن لەڕووی ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە کارێکی نارێك و قێزەوەنە.
ئەو کەسەی هەڵدەستێت بەکاری دزیکردن دەبێتە جێگای گومانی دەوروبەرەکەی بەگوێرەی پۆلینکردنی کەسایەتی لەلای قوتابخانەی دەروونشیکاری کە دەروونزان فرۆید رابەرایەتی دەکات، لایان وایە منداڵ لە سەرەتای تەمەنی دوو ساڵی تاکو دەگاتە پێنج ساڵی هەوڵ دەدات ئارەزووەکانی خۆی تێر بکات بێ ئەوەی گوێ بداتە دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و بەها ئایینی و یاساکانی دەوڵەت، بە بەڵگەی ئەوە هەموو شتێك بە موڵکی خۆی دەزانێت، کاتێك حەز و ئارەزووی دەچێتە شتێك ئەو شتە هەڵدەگرێ و بۆ خۆی دەیبات، بێ ئەوەی هیچ حیسابێك بۆ خاوەنی بکات.
لای دەروونشیکارییەکان حەزکردن بە هەبوونی شت (حب التملك) رەمەکە و لە هەموو کەسێکدا هەیە، منداڵیش بەشێکی گرنگە لە کۆمەڵگا.
فرۆید پشت بەوە دەبەستێت و دەڵێ (هەر کاتێك منداڵێك لە باوەش دەگری منداڵەکە دەست درێژ دەکات بۆ ئەو قەڵەمەی لە گیرفانتە، یاخود ئەو کڵاوەی لە سەرتە، بەڵام لەلای دەروونزان (پاڤلوڤ) کارەکە تەواو پێچەوانەیە و لای وایە منداڵ ئەو کاتە حەز بە هەبوونی شت دەکات و ئەو حەزەی لەلا دروست دەبێت و سەرهەڵدەدات کە ژینگە و دەوروبەری تەماح و چاوچنۆکی لە سەروەت و سامانی یەکتری دەکەن.

دەبێت ئەوەش بۆ مێژوو بگوترێ هەریەك لەو زانایانە ملكەچی سیستەمی ئەو دەسەڵاتە بوونە كە تێیدا ژیاون، فرۆید لە وڵاتێكی سەرمایەداری و پاڤلۆڤ لە سیستەمێكی سوشیالیستی.

كاتێك منداڵ گەورە دەبێت (هو id) جێبەجێ دەكات، بەڵام بەشێوەیەك حساب بۆ دەوروبەری بكرێت، وەكو رەچاوكردنی لایەنی دابونەریتە كۆمەڵایەتییەكان و سنوور نەبەزاندنیان، بەڵام لای هەندێك منداڵ دزیكردن بەردەوام دەبێت و، فێری ئەوەش بووە، واتە دەزانێت ئەو شتەی دەیبات موڵكی خۆی نییە، بەڵگەش ئەوەیە هەوڵی شت دزین دەدات و لە هەمان كاتیشدا تەماشای دەوروپشتی خۆی دەكات، هەر كاتێك دڵنیا بوو كەس دیار نییە، ئینجا دەست بە بردنی شتەكە دەكات.

لای قوتابخانەی دەروونشیكاری منداڵ كاتێك لە دایك دەبێت دەروونێكی شەڕەنگێزی هەیە، هەردەم خەریكی نانەوەی ئاژاوەیە، بەڵام لای سروشتییە، كان كە (جان جاك روسو) رابەرایەتی دەكات و هەروەها لای رەفتارییەكان بە رابەری (واتسن) لایان وایە ژینگە بەرپرسە لە دروستبوونی كەسایەتی منداڵ، روسو دەڵێت: (منداڵ دەروونی وەكو پەڕی كاغەز سپییە، بەڵام كاتێك دێتە ناو ژینگە ئەو ژینگەیەی تێدا پەروەردە دەبێت بەرەو لایەنی چاكە و خراپەی دەبات)، هەروەها واتسن دەڵێت: (١٠ منداڵی لەش ساغم بدەرێ، چۆنت بووێت وایان دروست دەكەم، كەواتە لای رەفتارییەكانیش هیچ بایەخێك بۆ هێزی رەمەكی بۆماوەیی نەهێشتۆتەوە تەنها ژینگە بەرپرسی یەكەمە بۆ رەوشتی خراپ و باش.

هۆكارەكانی دزیكردن لەلای منداڵ زۆرە، بەڵام هەر یەكێك لەو هۆكارانە دەوەستێتە سەر ئەو ژینگەی منداڵ تێیدا پەروەردە دەكرێت واتە جیاوازی هەیە لەنێوان ژینگەی منداڵێك لەگەڵ منداڵێكی دیكە.

توانستی عەقڵی و جەستەیی منداڵ زەمینە خۆشكەرە بۆی كاتێك دزی بكات، بۆ نموونە توانستی عەقڵی هەبێت دەتوانێت نەخشە دابرێژێت بۆ دزینی شت، هەروەها لە كاتی دزینی شتەكە دەتوانێت شتە دزراوەكە بەشێوەیەكی ئەوتۆ بەكار بهێنێت كەسانی دەوروبەری بە ئاسانی هەستی پێ نەكەن، هەر كاتێكیش گومانی لێ كرا



یاخود دزییەكەی لێ ئاشكرا بوو دەتوانێت بەرگری لە خۆی بكات و بیانوو بهێنێتەوە و بەرامبەرەكەی رازی بكات.

هەندێك لە لێكۆڵەرەوەكان دەڵێن هۆی سەرەكی دزیكردن هۆكاری ئابوورییە، منداڵ ناتوانێت حەز و ئارەزووەكانی خۆی تێر بكات یاخود بیانهێنێتەدی لەبەر ئەوە پەنا بۆ دزی شت دەبات، بۆ نموونە هەندێك جار وا دەبێت منداڵ لەڕووی ئابوورییەوە هەموو پێویستییەكانی ساز و ئامادە كراوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی دزین دەدات!

كەواتە لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە گەر پێویستی ئابووری تەواو ئامادە بێت ئەی هۆكار و پاڵنەری ئەو دزیكردنە چییە؟

زۆرجار پاڵنەر و هۆكاری دەروونی گەلێك بەهێزترە لە پاڵنەرەكانی دیكە، منداڵ ئەو كاتە هەست دەكات بێبەش بووە لە سۆزی دایك و باوك ئەو كاتە بۆ قەرەبووكردنەوەی ئەو بێبەشبوونە پەنا بۆ ئەو كارە دەبات، یاخود جاری وا دەبێت منداڵ حەز و مەیلی هەبوونی شتی هەیە، كاتێك كە دەبینێ لە ماڵەوەیان هەموو خاوەن شتن تەنها ئەو نەبێت، ئەویش هەوڵ دەدات لەو رێگایەوە كیان و بوونی خۆی بسەلمێنێت و ناسنامەی خۆی هەبێت پەنای بۆ دەبات، هەروەها تێكچوونی شیرازەی خێزان، كاتێك دایك و باوك ئاگایان لە منداڵەكانیان نامێنێ منداڵ تووشی ئەو كارە قێزەونە دەبێت، هەروەها بەكارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵ، هەروەها بەكارهێنانی توندوتیژی بەرامبەر بە منداڵ هۆكارێكی دیكەیە بۆ ئەوەی منداڵ فێری دزیكردن بێت، مەبەست لەو دزیكردنە تۆڵەسەندنەوەیەكە بەرامبەر ئەو كەسەی كە توندوتیژی بەرامبەری بەكار دەهێنێت، پاشان هەستی خۆ بەكەمزانین، منداڵ ئەو هەستەی لا دروست دەبێت هەوڵی قەرەبووكردنەوەی دەدات، دیسان بەنا بە پەروەردەكردنی منداڵ بەتایبەتی منداڵی تاقانە زیاد لە پێویست سۆز و خۆشەویستی دەدەنێ هەركاتێك منداڵی دووەمیان دەبێت لە سۆز و خۆشەویستی منداڵی یەكەم كەم كەم بكەنەوە و بیدەن بە منداڵی دووەم، لەو كاتەدا منداڵی یەكەم هەست دەكات هاوبەشی بۆ پەیدا بووە بۆ پڕكردنەوەی ئەو بۆشاییە پەنا بۆ دزیكردن دەبات.

چارەسەرکردنی دزیکردن، زۆر گرنگە بزانین هۆکاری دزیکردنەکە چییە؟ چونکە وەکو لە پێشەوە باسمان کرد منداڵ لەبەر گەلێك هۆکار پەنا بۆ ئەو کارە دەبات، جا کە زانیمان هۆکارەکە چییە چارەسەرکردنەکە بۆمان ئاسان دەبێت، بۆ نموونە زانیمان منداڵ بەبێ پرس دەستکاری شتی خوشك و براکانی دەکات پێویستە رایبهێنین کە پرس بکات، ئینجا دەستکاری بکات، بەپێچەوانەشەوە هەر کاتێك ئێمە دەستکاری شتی بکەین سەرەتا پرسی پێ دەکەین بۆ ئەوەی ئەویش رابێت و هەست بە بوونی خۆشی بکات، بەکارنەهێنانی توندوتیژی تاکو هەستی تۆڵەکردنەوەی لە رێگای دزیکردنەوە لەلا دروست نەبێت و بروا و متمانە بەخۆبوونی لەلا دروست بکرێت پاشان لە نزیکەوە ئاگاداری هەڵسوکەوتی بین و بزانین کاتی خۆی لەگەڵ کێ بەسەر دەبات نابێت هۆکاری راگەیاندنیش لەبیر بکرێت، پێویستە راگەیاندن فلیمی پەروەردەیی پیشانی منداڵ بدات بۆ ئەوەی فێری پەروەردەی دروست بێت.

## منداڵ و درۆکردن

درۆکردن یەکێکە لە کارە ناشیرینانەی کە دەکەوێتە خانەی لادانی رەوشت، بەداخەوە دەڵێم ئەو سیفەتە لای هەندێك کەس بۆتە دیاردە.
منداڵ لەو قۆناغەکانی گەشەکردنیدا گەلێك جار پەنا بۆ قسەکردنی نادروست دەبا، کە ئەوەش جۆرە گیروگرفتێك بۆ دایك و باوکان دروست دەکات، بەڵام زۆرجاریش وا دەبێت ئەو قسانەی منداڵ دەیکات ناچێتە خانەی درۆکردنەوە، بەڵکو بەشێکە لە خەیاڵی منداڵ هەوڵ دەدات ئەو شتانەی لە خەیاڵیدا هەیە دەریببڕێت بۆ ئەوەی سەرنجی دەوروبەرەکەی بۆ لای خۆی رابکێشێت، ئەوەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت منداڵ لەلایەن دەوروبەرەکەی خۆیدا فەرامۆش کراوە و گوێی بە خواست و ویستەکانی نادرێت، گەلێك جاریش وا دەبێت منداڵ پەنا بۆ درۆکردن دەبات، بەڵام دەبێت ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین ئایا منداڵ لەبەرچی پەنا بۆ درۆکردن دەبات وە یاخود کێ بەرپرسە لە درۆکردنی منداڵ؟



قوتابخانەی سروشتی لە پەروەردەدا کە (جان جاك روسو) رابەرایەتی دەکات دەڵێ: (منداڵ کاتێك لە دایك دەبێت خاوێنە وەکو کاغەزی سپی وایە، بەڵام کاتێك تێکەڵ بە ژینگە دەبێت، ژینگە بەرەو لایەنی چاکە و خراپەی دەبات) کەواتە ئێمە کوڕی ئەو ژینگەیەین کە تێدا پەروەردە دەبین، ئەو بۆچوونەی سروشتییەکان یەك دەگرێتەوە لەگەڵ رەفتارییەکانی ئەمریکی بەرێبەری دەروونزان واتسن.
واتسن دەڵێت (١٠ منداڵی لەش ساغم بدەرێ چۆنت بووێ وایان دروست دەکەم) ژینگە زەمینە خۆشکەرە بۆ رەخساندنی هەلی درۆکردن لەلای منداڵ، بۆ نموونە هەندێك جار زەنگی تەلەفۆن لێ دەدرێت، باوکەکە دەڵێت ئەگەر منیان ویست بڵێ لە ماڵ نییە، رەنگە هیچ مەبەستێکیشی نەبێت بەڵام ئەو قسەیە ئەوە دەگەیەنێ کە باوکەکە بەرێگای ناڕاستەوخۆ منداڵەکەی فێری درۆ کرد، هەروەها بەکارهێنانی توندوتیژی و سەرکۆنەکردنی منداڵ یارمەتیدەرێکی باشە بۆ ئەوەی پەنا بۆ درۆکردن ببات.
منداڵ کاتێك کارێك ئەنجام دەدات وەکو شکاندنی شوشەی پەنجەرە، ئەگەر منداڵەکە دڵنیا بێت سزا دەدرێت لەلایەن کەسوکارییەوە، جا بۆ پەردەپۆشکردنی ئەو هەڵەیە پەنا بۆ درۆکردن دەبات، چونکە لە هزر و بیری منداڵ درۆکردن ئاسانترین رێگایە بۆ خۆ دەربازکردن لە سزادانداً.
لێرەدا زۆر پێویستە منداڵ لە رێگای ئامۆژگاریکردنەوە قەناعەتی پێ بهێنرێت ئەو کارەی کردوویەتی هەڵەیە و نابێت دووبارە بکاتەوە وەکو ئەوەی منداڵ دەستکاری (TV) دەکات و کەناڵەکانی تێك دەدات، لەو حاڵەتەدا دایك و باوك دەبێت لەگەڵ منداڵەکانیان قسە بکەن و بڵێن ئەگەر جارێکی تر دەستکاری بکەی و تێك بچێت ئێمە ناتوانین فلیمەکانی کارتۆن ببینین، چونکە فلیمی کارتۆن لای ئێمە گرنگە.
هەروەها تێکچوونی شیرازەی خێزان هۆکارێکی دیکەیە بۆ درۆکردنی منداڵ کاتێك دەبینین دایك و باوك لەناو خێزاندا قسەی راست و دروست لەگەڵ یەکتردا ناکەن، ئەو رەفتارەی دایك و باوك رەنگدانەوەی لەلای منداڵ دەبێت.
گەلێك جاریش وا دەبێت درۆکردن پەیوەندی بەخودی منداڵەکەوە هەیە کاتێك دەبینین منداڵ بڕوای بەخۆی نییە، بۆ خۆپاراستن لە دەستدرێژی و هێرشی گەورەکان و خۆپاراستن

پەنا دەباتە بەر درۆکردن هەروەها هەستی خۆ بەکەمزانینی هەبێت منداڵ لەو کاتەدا هەوڵی قەرەبووکردنەوەی دەدات ئەویش لە ڕێگای گێڕانەوەی چیرۆکی هەڵبەستراو، لایەنێکی دیکە کە هاندەرە بۆ درۆکردن پەیوەندی نێوان منداڵ و کۆمەڵگا واتە دەوروبەرەکەی کاتێك دەوروبەر ئەرکێکی گران دەخاتە سەرشانی منداڵ لەنێوانیاندا نییە ئەو ئەرکە جێبەجێ بکات پەنا بۆ درۆ دەبات بۆ ئەوەی بەرامبەرەکەی رازی بکات، جا بۆ ئەوەی درۆ نەبێتە دیاردە لەلای منداڵ هەر لە سەرەتاوە بتوانین منداڵ رابهێنین لەسەر راستگۆیی نابێت تاوانی درۆ بخەینە پاڵ منداڵ راستەوخۆ بڵێین تۆ درۆزنی دەبێت بڵێین رەنگە ئەو قسەیە بەو شێوەیە نەبێت کە تۆ دەیڵێی، ئەوەش هەلێکە بۆ منداڵ دەرەخسێنین بۆ ئەوەی بەخۆیدا بچێتەوە، هەروەها شکاندنەوەی منداڵ یاخود وەکو دەڵێن درۆی لێ سپی بکەینەوە بەتایبەتی لەبەردەم خەڵك و هاوڕێکاندا چونکە ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی جارێکی دیکە رووی نەیەت لەبەردەم هاوڕێکانیدا قسە بکات و رەنگە هاوڕێکانی بە درۆزن ناوی ببەن، هەروەها چاندنی تۆی بڕوا بەخۆبوون لەلای منداڵ کاتێك بڕوای بەخۆی هەبوو پەنا بۆ درۆ نابات.
نابێت رۆڵی راگەیاندن فەرامۆش بکەین کە کاریگەری زۆری هەیە لەسەر منداڵ ئەویش لە ڕێگای پیشاندانی فلیم و شانۆ و بەرمانەی سوودبەخش کە منداڵ فێری راستگۆیی دەکەن.

## پەنجە مژین

پەنجە مژین یەکێکە لە دیاردە رەفتارییەکان کە دەبێتە خوو لەلای هەندێك منداڵ.
پەنجە مژین بە خوویێکی سروشتی دادەنرێت لە قۆناغی منداڵیدا، گەلێك جاریش وا رێك دەکەوێت دەگاتە ئاستی مژینی پەنجەکانی قاچیشی، پاشان وردە وردە ئەو خووە روو لە کزی و نەمان دەکات، بەڵام لای هەندێك منداڵ ئەو خووە بەردەوام دەبێت، بەردەوامی ئەو خووە لای منداڵ تاکو تەمەنی گەورەیی بەڵگەیە لەسەر کەم ژیری یاخود پەروەردەکردنی منداڵ لەلایەن خێزانەکەیەوە بەشێوەیەکی نادروست، یاخود بە



مانایەکی دیکە بڵێین کەم ژیری منداڵ و خراپ پەروەردەکردنی منداڵ زەمینە خۆشکەرە بۆ بەردەوامی ئەم دیاردەیە.
پەنجە مژین گەلێك جار دەبێتە مایەی ترس لەلایەن دایکان و باوکانەوە، کاتێك دەبینن ئەو خووە لەلای منداڵەکانیان پەیدا بووە، بەڵام پزیشکەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە مادام منداڵ ددانی شیری هەیە ئەوە نابێتە جێگای ترس و نیگەرانی بۆ ئایندەی منداڵەکە.
زانایانی دەروونزانی بەردەوامی ئەو دیاردەیە دەگەڕێننەوە بۆ گەلێك هۆی جیا جیا، هەندێکیان بڕوایان وایە کاتێك منداڵ بێبەش دەبێت لە سۆز و میهرەبانی دایك و باوکی هەوڵی ئەوە دەدات لەڕووی دەروونییەوە خۆی رازی بکات، بۆیە پەنا دەباتە بەر پەنجە مژین، کەچی هەندێکی دیکە لە دەروونزانەکان وای بۆ دەچن کە پەنجە مژین هۆیەکی زگماکی هەیە.
بەشێوەیەکی گشتی باری دەروونی رۆڵی خۆی دەگێڕێ لەسەر جێگیرکردنی ئەو دیاردەیە کاتێك منداڵ هەست دەکات یەکێکی لە خۆی بچووکتر هەیە لە ماڵەوە وەکو خوشك و برا زیاتر سۆز و خۆشەویستی بەوان دەدرێت لەلایەن دایك و باوکەوە ئەویش بەشێوەی بێ هەستی پەنا دەباتە بەر یەکێك لە میکانیزمەکانی بەرگری کە پێی دەگوترێ گەڕانەوە بۆ سەردەمی پێشوو (نکوص) کە ئەو ماوەیە جۆرێك لە هێمنی و دڵنیایی مسۆگەر دەکات بۆ منداڵ.
ترسناکی ئەو خووە لە تەمەنی شەش ساڵی و بەرەو ژوور دەبێتە هۆی شێواندنی گەشەکردنی کاردانەوەیەکی نێگەتیڤانەی دەبێت لەسەر منداڵ.
باشترین ڕێگاچارە بۆ دەست هەڵگرتنی منداڵ لەو خووە نارێکە، دەبێت منداڵ جۆرە ئازادییەکی بدرێتی و تێکەڵاوی ناو منداڵان بکرێت بۆ ئەوەی خۆی لەبیر بکات، یاخود بە هیچ جۆرێك ماوەی ئەو جۆرە منداڵانە نەدەین بەدەست بەتاڵی دانیشن، بەڵکو خەریکیان بکەین بەیاریکردن کە ئەوەش هۆیەکی دیکەیە بۆ خۆ لەبیرکردن، هەروەها دوورکەوتنەوە لە سزادان و هەڕەشە لێکردن، هەوڵی ئەوەش بدرێت کە منداڵ هەست نەکات پشتگوێ خراوە یاخود کەسانی تر خۆشەویستترن لە ئەو.

دەروونزانی ئەزموونگەری لە هەوڵی ئەوەدان کە بتوانن بە کەمترین کات بەسەر ئەو گرفتەش زاڵ بن، بۆ نموونە هەر کاتێك زانرا منداڵ فێری ئەو کارە بووە و بە ئاسانی دەست هەڵناگرێ لەو خووە ناچار دەبین پەنجەکانی بۆیاغ دەکەین بە رەنگێکی ناشیرین بۆ ئەوەی قێزی لێ ببێتەوە یاخود سەرە پەنجەکانی هەندێك بیبەری تیژی پێوە دەکەین بۆ ئەوەی هەر کاتێك پەنجەکانی خستە دەمییەوە ئازاری بدات، ئەگەر جارێکی دیکە هەوڵی دا دووبارەی بکاتەوە ئازاری جاری یەکەمی بکەوێتەوە بیری، کە ئەوەش دەچێتەوە سەر رێگای دەروونزان پاڤلوڤ کە پێ دەڵێن کوژانەوە (انطفاء) واتە بێ هێزی و لاوازی لەنێوان رووژاندن و وەڵامدانەوە.
لە کۆمەڵگای کوردەواریش ئەوە باوە کاتێك دەیانەوێت منداڵ لە شیر بکەنەوە دایکەکە شتی پیس یاخود چوار دەوری مەمکی بەتەنی رەش دەکات بۆ ئەوەی منداڵ قێزی لێ ببێتەوە و جارێکی دیکە داوای نەکات لە بیری بچێتەوە.

## خۆ بەکەمزانین

خۆ بەکەمزانین راستەوخۆ بەستراوەتەوە بە مەسەلەی ترس، بەڵام ترس لە چ؟ ترس لەو کارەی کە دەیەوێت ئەنجامی بدات بەڵام دەترسێت تێیدا سەرکەوتوو نەبێت لە هەمان کاتیشدا لە سەرکەوتنی کارەکەی دڵنیایە، بەڵام بەهۆی بڕوا نەبوون بەخۆی ناتوانێت کارەکە ئەنجام بدات، بۆ نموونە گەلێك جار قوتابی بەرەورووی ئەو کێشەیە دەبێتەوە کاتێك مامۆستا پرسیارێك ئاراستەی قوتابییان دەکات ئەو قوتابییە وەڵامەکەی دەزانێت، بەڵام بڕوای بەخۆی نییە وەڵام ناداتەوە، ئەگەر ناچاری وەڵامدانەوەش بکرێت تووشی شپرزەیی دەبێت ناتوانێت وەڵامەکە وەکو پێویست بداتەوە، کەواتە ترس و خۆ بەکەمزانین پەیوەندییەکی بەهێز و پتەویان لەنێو خۆیاندا هەیە.
خۆ بەکەمزانین زۆر بڵاوە لەنێو مرۆڤدا، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی کیانی سەربەخۆیی و بزربوونی ئاسایش و هەبوونی ترس لەلایەن کەسەکانەوە. دیاردە سەرەکییەکانی ئەو خۆ بەکەمزانینە دەگەڕێتەوە بۆ دوودڵی لە شت، هەروەها زمان



گرتن کە ناتوانێت وشەکان بەرێکوپێکی دەربڕێت، هەروەها شەرم و نەبوونی توانستی بیرکردنەوە و نەبوونی جەسارەتکردن و چاوەڕێکردنی شتی خراپ لە کاتی کارکردندا، هەر کاتێك دەست بۆ هەر کارێك دەبات هەزار حیسابی بۆ دەکات، گەر کارەکە بچووك بێت یاخود گەورە، ئەوەش پێش دەست پێکردنی کارەکە.
ئەو هەموو بیرکردنەوەیە دەبێتە هۆی خۆ بەکەمزانین یاخود بڕوا بەخۆ نەبوون، بەڵام لەلای دەروونزان (ئەدلەر) خۆ بەکەمزانین مانایەك و تەفسیرێکی دیکەی بۆ دەکات، بۆچوونێکی سەربەخۆی هەیە، دیارە ئەو بۆچوونەی (ئەدلەر) دەربارەی خۆ بەکەمزانین وەك ئەوە نییە کە ئێمە تێیگەیشتووین.
(ئەدلەر) پێی وایە مرۆڤ دەبێت هەستی خۆ بەکەمزانینی هەبێت، چونکە هەستی خۆ بەکەمزانین دەبێتە پاڵنەر یاخود جۆرێك لە تێکۆشان بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی هاوڕێکەی، هەتا هەستی خۆ بەکەمزانینی نەمێنێت، بۆ نموونە قوتابییەك لە ئاست قوتابییەکی هاوڕێی خۆی بەکەم دەزانێت نمرەی خراپتر بەدەست دەهێنێت ئەوە هەستی خۆ بەکەمزانینی لەلا دروست دەکات، جا لەو بارەدا ئەو خۆ بەکەمزانینە دەبێتە پاڵنەر بۆ ئەوەی هەوڵ بدات و تێ بکۆشێت هەتا نمرەی بگاتە ئاستی هاوڕێکەی، کاتێك گەیشتە ئاستی ئەو، ئەو هەستەش لەلای نامێنێت.
کەواتە بۆچوونەکەی ئەدلەر گەلێك جیاوازە لەوەی ئێمە کە تێگەیشتووین، خۆ بەکەمزانین سەرەتا لە قۆناغی منداڵییەوە دەست پێدەکات، کاتێك منداڵ ئەندامەکانی لەش نەگەییوون، پشت بە دایك و باوکی دەبەستێت لە ئیش و کارەکاندا، سەیر دەکات دایك و باوکی بەهێز و بە توانان، خۆشی کەسێکی بێ هێز و بێ توانایە گەر دایك و باوکی یارمەتیی نەدەن ئەو دەسەڵاتی هیچی نییە، بۆیە حەز دەکات وەکو ئەوان گەورە و بەهێز بێت و پشت بەخۆی ببەستێت، بۆ نموونە منداڵ کە بچووکە ناتوانێت دەرگای ماڵەوە دابخات و بکاتەوە چونکە هێشتا بچووکە و دەستی ناگاتە کیلۆنی دەرگا، پێویستی بە یەکێکی دیکە هەیە، کە لە خۆی گەورەتر بێت بەڵام کاتێك باڵای بەرز دەبێت و توانای دەرگاکردنەوەی دەبێت کەیفخۆش دەبێت و

هەست دەکات گەیشتۆتە ئاستێك توانای هەیە پشت بەخۆی ببەستێت بڕوا و متمانەی لەلا پەیدا دەبێت و هەستی خۆ بەکەمزانینی لەلا نامێنێت.

## منداڵ و شەرمکردن

شەرمکردن دیاردەیەکی نائاساییە لە دیاردەکانی دەروونی، کە مرۆڤ بە گشتی و منداڵ بەتایبەتی تووشی دەبێت، کەواتە دیاردەی رەفتاری بەشێوەیەکی نێگەتیڤانە دەنگ دەداتەوە لە دەروونی مرۆڤ بە گشتی و منداڵ بەتایبەتی.
پسپۆرانی دەروونی شەرمکردن دەگەڕێننەوە بۆ گەلێك هۆکاری جیاجیا، دیارترینیشیان بەسەر خۆشکاندنەوە و بڕوا بەخۆ نەبوون تێکەڵاو نەبوونیان لەگەڵ ژینگە، جگە لەوانەش هۆکاری بۆماوەییش رۆڵی خۆی دەگێڕێت لەسەر شەرمکردن.
منداڵ کاتێك دڵنیا نەبێت لە دەوروپشتەکەی، کاتێك منداڵ پرسیار دەکات، یاخود پرسیاری لێ دەکرێت بەشێوەیەکی ناشیرین بەرپەچ دەدرێتەوە، هەروەها هەندێك جار منداڵ بیروڕای خۆی دەردەبڕێت گاڵتەی پێ دەکەن ئەوانە هەر هەموویان دەبنە هۆکاری ترسان لە دەوروبەر و بڕوا بەخۆ نەبوون، هەر کاتێك پرسیاری لێ بکرێت لە ترسان وەڵام ناداتەوە یاخود بیروڕایەکی هەبێت ناتوانێت دەریببڕێت.
منداڵی شەرمن کاتێك پرسیاری لێ دەکرێت سەری خۆی دادەخات یاخود خۆی دەشارێتەوە یاخود بەدەستەکانی چاوەکانی هەڵدەپشێوێ هەر کاتێك وەڵام دەداتەوە دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێ.
(فرۆید) دەڵێت (تەمەنی پێنج ساڵەی یەکەمی منداڵ زۆر گرنگ و هەستیارە، چونکە لەو تەمەنەدا نەخشەی کەسایەتی دوارۆژ دادەرێژێت).
منداڵ ئەگەر بڕوای بەخۆی نەبوو ناتوانێت لەگەڵ هاوتەمەنەکانی خۆیدا یاری بکات، بۆیە پەنا دەباتە بەر منداڵی لە خۆی بچووکتر بۆ ئەوەی یارییان لەگەڵدا بکات.



## شەرمکردن دوو جۆرە:

یەکەمیان ئەو جۆرە شەرمەی منداڵ لە ئەنجامی نیگەرانی دەروونی تووشی دەبێت و کۆسپ و تەگەرە دەخاتە بەردەم ئیشکردن و بەرهەمهێنانی، ئەو جۆرە پێویستە هەر زوو بەزوو چارەسەر بکرێت چونکە ئەوە بەشێکە لە نەخۆشی دەروونی.
جۆری دووەمیان بە هیچ شێوەیەك ئەو شەرمە نابێتە کۆسپ و تەگەرە لەبەردەم کار و چالاکی، بەڵکو بە پێچەوانەوە شەرم دەبێتە هۆیەك بۆ بەرزکردنەوەی پلەوپایەی ئەو کەسە لەناو کۆمەڵگادا، هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت دەربارەی کچەکانی شوعەیب پێغەمبەر: (فجاءته احدهما تمشي على استحياء قالت ان ابي يدعوك ليجزيك اجر ما سقيت).
گرنگترین رێگاچارە بۆ چارەسەرکردنی منداڵی شەرمن یارمەتیدان و هاندانیەتی ئەویش گرنگیدان بەبیروباوەڕ و بۆچوونەکانی، هەروەها نابێت منداڵ لەسەر شەرمکردن سزا بدرێت بۆ ئەوەی بڕوا و متمانەی لەلا دروست بێت.

## ئاستەنگەکانی زمان

زمان بەشێوەیەکی گشتی هۆیەکە بۆ بەیەکگەیاندنی کۆمەڵایەتی، لەلای دەروونزانەکانیش بریتییە لەوەی مرۆڤەکان لە یەك بگەن جا بەهۆی بەکارهێنانی هەر ئامرازێك بێت.
دەربڕینی قسە لەلای منداڵ پەیوەندی هەیە بەگەشەکردن، بەتایبەتی گەیینی ئامرازەکانی دەنگ وەکو (گەروو، زمان، دەم و ددان... هتد)
سەرەتا وشە دەربڕین لەلای منداڵ لە سەرەتای تەمەنی پازدە مانگییەوە دەست پێدەکات، دیارە گەشەی عەقڵیش رۆڵی خۆی دەگێڕێت، گەر هاتوو منداڵ گەشەی عەقڵی خێراتر بێت زووتر دەست بە قسە دەکات.
هەندێك لە منداڵان سەیر دەکەین لە کاتی قسەکردندا بەرەورووی کێشەیەکی گەورە دەبنەوە ئەویش ئەوەیە ناتوانن قسە یاخود وشەکان دەربڕن وەکو پێویست، بەشێك

لەوانە بەهۆی باری جەستەییەوە کە پێیان دەگوترێ (فسە زمان) کە ناتوانێت مافی خۆی بداتە وشە یاخود وەکو خۆی دەری ببڕێت وەکو وشەی کەرکوك دەکاتە تەرتوت یاخود ئەلف دەکاتە ئەنف... هتد، بەڵام هەندێکی دیکە وشەکان لەڕووی دەربڕینەوە بە تەواوی دەردەبڕێت بەڵام بەزەحمەت وەکو هەر کارێك دەیەوێت بڵێت مامۆستا گەلێك بەزەحمەت دەڵێ (م م م مامۆستا).

هۆکارەکانی ئاستەنگی زمان گەلێك هۆکارە، لەوانە هۆکاری جەستەیی و دەروونی ژینگە و بۆماوە لە هۆکارەکانی جەستەیی وەکو کەموکوڕی لە گەڕوو و زمان شاشی ددانەکان، هەروەها هۆکاری بۆ ماوەییەش منداڵ لە دایك و باوکییەوە ئەو زمان گیرانەی بۆ دەمێنێتەوە، پاشان هۆکاری ژینگە ئەو منداڵەی بەهۆی جیاوازی شێوەی قسەکردنی دایك و باوکی یاخود دایەنەکەی تووشی ئەو پەشێویە دەبێت، منداڵێك لە دایك و باوکێك لە دایك بووە بۆ نموونە بە زمانی کوردی قسە دەکەن بەڵام کە سەفەر دەکەن بۆ وڵاتێکی دیکە لەو وڵاتە بەزمانێکی دیکە قسە دەکەن و تێکەڵ بە کۆمەڵگای ئەو وڵاتە دەبێت یاخود لە قوتابخانەی ئەو وڵاتە دەست بەخوێندن دەکات، کە ئەوانە پێیان دەگوترێ ناهاوسەنگی لەنێوان خێزان و کۆمەڵگا، پاشان پشت بەستنی زیاد لە پێویست لەسەر خەڵکانی دیکە ئەوانە هۆکاری ژینگەن کە کاریگەری دەبێت لەسەر زمان پاراوی و رەوانی.

گرنگترین هۆکاری زمان گیران لایەنی دەروونییە ئەویش پەشێوی دەروونی دەربڕینی قسە ئاماژەیە بۆ پەشێوی لە کەسایەتی.

شەرم و گۆشەگیری کە حەز بەتەنهایی بکات دەبێتە رێگر لەبەردەم دەربڕینی وشەکان کاتێك بەرامبەر یەکێك قسە دەکات رەنگی سوور هەڵدەگەڕێت و زمانی دەگیرێت، پاشان بڕوا بەخۆ نەبوون زانایان ئەو زمان گیرانەیان بۆ دوو جۆر پۆلین کردووە، جۆری یەکەمیان ئەو شەرم و تێکەڵاو نەبوونەیەتی لەگەڵ ژینگەی دەوروبەری زۆر هەستیارە لە قسەکانیدا، بۆیە توانای دەربڕینی نابێت، هۆکاری دووەمیشیان تووڕەبوونە ئەو کاتەی تووڕە دەبێت لەبەر تووڕەبوون قسەکانی بۆ نایەت بەڵام ئەوە بەشێوەیەکی کاتییە هەر کاتێك ئەو هەڵچوونەی نەما دێتەوە باری ئاسایی خۆی.



دەروونزان (بیرت) دەڵێت: (زمان گیران لە تەمەنی (٥) ساڵیدا سەرهەڵدەدات، کە سەرەتایە بۆ چوونە قوتابخانە و بەلای ئەو منداڵەوە ژینگەیەکی نوێیە، هەروەها لە تەمەنی (٧ – ٨) ساڵیدا گواستنەوەی قۆناغی خوێندنە بەشێوەیەکی نیمچەیی، لە تەمەنی (١٢ – ١٣) ساڵی قۆناغی گواستنەوەی خوێندنە، لە تەمەنی (١٥) ساڵی سەرەتایە بۆ چوونە نێو قۆناغی هەرزەکارییەوە[١].

زمان گیران زیاتر لەلای کوڕان بەدیار دەکەوێت نەوەك لەلای کچان ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەندامەکانی قسەکردنیان بەخێرایی گەشە دەکەن، هەروەها لەلای کوڕانیش فشاری دەروونی زیاتر وەك لەلای کچان، هەروەها ئەو زمان گیرانە لەلای خەڵکانی شار زیاترە وەك لە گوندەکان، ئەویش بەهۆی هۆکاری ئاڵۆزی ژیان بۆ نموونە لە شارەکان شارستانییەت ئاڵۆز بووە، هەر کاتێك دەتەوێت قسە بکەی هەوڵی ئەوە دەدەیت وشەکان برازێنیتەوە ئەو توانایەش نییە بۆیە زمانی تێك دەئاڵێ، بەڵام خەڵکی گوندەکان زیاتر مرۆڤی ئاسایین هەر بە ئاسایی خۆی قسە دەکەن وەکو ئەوەی کە هەیە بۆیە بەرەوڕووی ئەو گرفتە نابنەوە.

چارەسەری ئەو گرفتەش هەوڵ بدرێت رێژەی شەرم لەلای کەم بکرێتەوە و بڕوا بەخۆبوونی لەلا زیاد بکەین و تێکەڵاوی کۆمەڵگا بکرێت قسە بکات، چونکە گەلێك جار وا دەبێت کە منداڵ زمانی دەگیرێ ئەوە دەبێتە هۆیەك پرسیاری لێ نەکرێت، ئەگەر زمانیشی گیرا لەلامان ئاسایی بێت لەسەری رادەوستین هەتا دێتەوە دۆخی جارانی، هەوڵدان بۆ ئەوەی ترس نەمێنێت لە دەوروبەری.

## میزکردنی شەوانە

میزکردنی شەوانە شتێکی سروشتییە لەلای هەموو منداڵێك لە سەرەتای تەمەنی یەك ساڵیا، پاش ئەو تەمەنە وردە وردە ئەو میزکردنە کەم دەبێتەوە لە تەمەنی دوو

١- اسس الصحة النفسية، عبدالعزیز القوص.

ساڵیدا، پاشان ئەو خووە بە ڕێژەی ٨٩٪ کەم دەبێتەوە، و لە تەمەنی سێ ساڵیدا لەلای زۆربەی منداڵاندا نامێنێت.

ئەو خووە لەلای هەندێك منداڵ بەردەوام دەبێت بەبێ ئەوەی هیچ پەیوەندییەکی بە زیرەکییەوە هەبێت.

ئەگەر هاتوو منداڵ لە سەرووی ئەو تەمەنەوە بەردەوام بوو، پێویستە دایکان و باوکان بەجیددی لەو مەسەلەیە بکۆڵنەوە و ڕێگاچارەی بکەن.

هۆکارەکانی میزکردنی شەوانە لەلای منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ هۆکاری جەستەیی و هۆکاری دەروونی، هەندێك جاریش هەردوو هۆکار بەیەکەوە دەبنە هۆی سەرهەڵدانی ئەو خووە لەلای منداڵ.

هۆکاری جەستەیی میزکردنی شەوانە وەکو هەستیاری لە کۆئەندامی میزڵدان و گەورەیی و فراوانی میزڵدان و هەروەها بریندار بوونی ڕێڕەوی کۆئەندامی میزکردن و کەموکوڕی لە بڕبڕەی پشت و نەخۆشی شەکرە و کەم خوێنی و هەروەها هەبوونی کرمی بەهاریزیا.

زانا (همبورجر) دەڵێت هۆکاری میزکردن لەلای منداڵ دەگەڕێتەوە بۆ عەیب لە بڕبڕەی پشت و کەم عەقڵی، هەروەها زانا (کامل) دەڵێت داخستنی و گیرانی ڕێرەوی میزکردن.

هەموو کەسێك کۆئەندامی دەماری هەیە، ئیشی سەرەکی کۆئەندامی دەمار ئەوەیە لە هەر کار و چالاکییەکی ئەندامەکانی لەش مێشك ئاگادار دەکاتەوە، مێشکیش بە دەوری خۆی هەڵدەستێ بە هەمان شێوە بەهۆی دەمارەکانەوە خەبەر دەداتەوە جا ئەو منداڵانەی شەوانە میز دەکەن دەمارەکانیان لاوازە و ناتوانن وەکو پێویست بەکاری خۆی هەستێت کاتێك منداڵ میز دەکات مێشك ئاگادار نەکراوەتەوە واتە بەبێ ئاگاداری مێشك میز بەخۆیدا دەکات.

هۆکاری دووەم پەیوەندی بە دەروونی منداڵەوە هەیە، هەندێك جار هۆکاری ترس لە شتی دەوروبەری وەکو ترسان لە ئاژەڵ و تاریکی و تەماشاکردنی فلیمی ترسناك هەڕەشەی کەسانی لە خۆی گەورەتر، ئەمانە هەموویان دەبنە فێڵی بێ هەستی و میز بەخۆیدا دەکات.



دەروونزان (لیفی) دەڵێت میزکردنی منداڵ لە کاتی شەودا دەبێتە پەرچەکردار و پەنا بۆ میکانیزمی بەرگری دەبات (نکوص) واتە گەڕانەوە بۆ سەردەمی منداڵی ئەویش لە ڕێگای نەمان و ونکردنی خۆشەویستی، کەچی لەلای دەروونزان (مور) ئەو میزکردنە دەگەڕێتەوە بۆ هیلاکی و ماندووبوون، هەروەها لەلای (محمد عبدالظاهر) ئەو میزکردنە کاردانەوەیەکی دوژمنکارییە.

بەشێوەیەکی گشتی هۆکاری دەروونی لایەنێکی سەرەکییە لەو خووەی منداڵ، هەندێك جار دەبینین منداڵ زیاد لە پێویست بەناز پەروەردە دەکرێت، هەندێك جاری دیکە منداڵ فەرامۆش دەکرێت زیاد لە پێویست، ڕەنگە لە شەوێکدا زیاتر لە جارێك میز بەخۆیدا بکات دایك ئاگاداری نەبێت، بۆیە پێویست دەکات دایك ئاگاداری منداڵەکەی بێت هەر کاتێك هەستی کرد منداڵەکەی خۆی تەڕ کردووە دەبێت جلی بگۆڕێت و خاوێن و وشکی بکاتەوە، هەروەها کەمکردنەوەی سۆز و خۆشەویستی کاتێك خێزانێك تەنها ئەو منداڵەیان هەیە سۆز و خۆشەویستی زۆری دەدەنێ پاش ماوەیەك منداڵی دووەمیان دەبێت هەندێك لە سۆز و خۆشەویستی کەم دەکەنەوە بۆیە منداڵەکە هەست دەکات هاوبەشی بۆ پەیدا بووە، وەکو تۆڵەکردنەوەیەك پەنا بۆ ئەو کارە دەبات.

باشترین ڕێگاچارە بۆ نەهێشتنی ئەو خووە لای منداڵ، دەبێت سەرەتا دەستنیشانی هۆکارەکەی بکرێت، گەر توانرا دەستنیشان بکرێت چارەسەری ئاسانە، بۆ نموونە منداڵ فەرامۆش کراوە هەوڵ دەدەین گرنگی پێ بدرێت یاخود زیاد لە پێویست بەنازە وەکو جاران ئەو نازەی نادەنێ، لەڕووی جەستەییشەوە ئەگەر جەستەی تەواو نەبوو لە ڕێگای دەرمانەوە چارەسەری ئەدەینێ، وە هەروەها شەوان پێش نووستن میزی پێ بکەین، ئەگەر گونجا شەوانیش هەڵیدەستێنین و میزی پێ دەکەین و هەوڵ بدەین سەرمای نەبێت و شلەی زۆری نەدەینێ.

## ئەو سەرچاوانەی کە سوودیان لێ وەرگیراوە:


المدخل في علم النفس/ محمد محمود عبدالجبار.

مدخل علم النفس/ لندا دافيدون، ترجمة د. سيد الطواف و د. محمود عمر.

علم النفس التربوي/ د. فاخر عاقل.

علم النفس التربوي/ د. جابر عبدالحميد.

علم النفس التربوي/ تأليف اثر جيس/ ترجمة عبدالعزيز القوصي.

علم النفس وتطبيقاته التربوية والأجتماعية/ عبد علي الجسماني.

اصول علم النفس/ احمد عزت راجح.

اصول علم النفس وتطبيقاته/ د. فاخر عاقل.

علم النفس الطفولة والمراهقة/ جمال حسين الالوسي، اميمه علي خان.

سيكولوجية الطفولة والشخصية، كونجر، ترجمة احمد عبدالعزيز، جابر عبدالحميد.

التربية بين الوراثة والبيئة/ د. عبدالامير شمس الدين.

التعلم واسسه ومناهجه ونظرياته، احمد زكي صالح.

اسس الصحة النفسية/ د. عبدالعزيز القوصي.

دراسات في علم النفس/ دحام الكيال.

المدخل في علم النفس/ د. هاشم جاسم السامرائي.

الأسرة والمشاكل الأخلاقية للأطفال/ د. علي القائمي.

التربية الاسلامية للأولاد/ د. عبدالمجيد طعمه.

موقف الأسلامي من تنشئة الطفل/ سيد ابراهيم طائل.

الاسس النفسية للنمو/ فؤاد السيد ابهى.